# لە بەرزیدا

نووسەر : عەلی ئەحمەد

ساڵی چاپ : ٢٠٢٣

بابەت : پەروەردەیی

هەڵەچن : هەڵەچنی ئاسۆ

چاپخانە : چاپخانەی بەیبوون، قەڵادزێ

دیزاینی بەرگ : عبداللە ساڵح @fuji_xv

وێنەی دەرەکی : PlaygroundAI + Google Images

قەبارەی پەڕتووک: ١٤سم بە ٢١سم.

وشەکان : ٢٥،٥٦٩ وشە

---

# پێشکەش

- پێشکەش بە کورد.
- پێشکەش بە هەموو بازنە مەعریفی و فەلسەفی و زانستییەکانی جیهان و بەتایبەتتر کوردستان.
- پێشکەش بە ئەکرەم مەولود (پیرە هەولێر). ئەو کەسەی فێری نووسینی کردم.
- پێشکەش بە مرۆڤە دڵسۆزەکانی دەورووبەرم.
- پێشکەش بەوانەی خولیای زانین.

# سوپاس و پێزانین

- ئەکرەم مەولود (پیرە هەولێر) کە فێری نووسینی کردم.
- عبداللە صالح (@fuji_xv) بۆ دیزاینی پەڕتووکەکە..
- وەزگێڵ ئەشرەف بۆ دەستەبەرکردنی ستراتیژیەتی دابەشکردنی پەڕتووکەکە.
- ستافی هەڵەچنی ئاسۆ — AsoSpell.
- ڕۆژگار کەرکووکی، یەکێک لە ئەدمینە پێشەنگەکانی ماڵپەڕی کوردیپیدیا.
- کاک ڕێبواری چاپخانەی بەیبوون لە قەڵادزێ.

# ناوەڕۆک

تاڵی ژیان بوو بە هەنگوینی ژیان. درووود بۆ خودا.

عەلی ئەحمەد.

# چەند گوتەیەکی نووسەر

به ناوی خودای بەخشندە و میهرەبان

زانیاری مەعریفەت نییە،

– ئەلبێرت ئاینشتاین (Albert Einstein)

درووود کــە دووبــارە گەڕامــەوە و تــوانیم پــەڕتووکێکی بــە پێزی دیکە بۆ پەڕتووکخانەی کوردی زیاد بکەم. نووسـینی پــەڕتووک ئــەرکێکی ئاســان نییــە و بەرپرســیاریەتی زۆر لەگەڵە ... لەم پەڕتووکەدا هەوڵم داوە بەشێکی نووسـینەکانم کۆ بکەمەوە و بەرهەمێکی بەپێزی لێ دابتاشم.

بەشێکی زۆری نووسینەکانی ئەم پەڕتووکە، دەگەڕێنەوە بۆ ســاڵانی ٢٠١٥ و ٢٠١٦. ئــەو کاتانــەی تــازە دەســتم بــە نووسینەوە و تێڕامان کردبوو. لەم پەڕتووکەدا بەبێ لابردن و بــڕین و سانســۆرکردنی هیچ نووســینێک، هــەوڵم داوە

بەشـێکی زۆری نووسـینەکان دەسـتکاری بکـەم بـۆ ئـەوەی جوانـتر مانـای خۆیـان بگەیـەنن. وە هیـوادارم لـە چـاوی خوێنەردا توانیبێتم ئەم ئەرکە پیرۆزە بەجێ بگەیەنم.

ڕەنگە پێشـتر بابەتـەکانی منتـان خوێندبێتـەوە و ئاگـا دار بن کە زیاتر من لە بازنەی فەلسەفی و فیکرییەوە بۆ بابەتـەکان دەڕوانم. وە بێشـک ئـەم پەڕتووکـەش بێبـەری نـابێت ئـەم بابەتانــە. لـــە خوێنـــەری ناشـــارمەوە ئـــەم پەڕتووکـــە خوێندنـەوەی گـەلێک قورسـە. وە ئەگـەرچی هـەوڵم داوە تـا توانیبێتم بابەتەکان سادە و کورت بکەمەوە، هێشـتا قورسـی خۆیـان لەدەسـت نـەداوە. چونکـە سرووشـتی بابەتـەکان قورسن و ئاڵۆزن.

ئەم پەڕتووکەی لەبەردەم خوێنەردایە، لە پارچە شـیعرێک و شانزدە بەشی سـەرەکی پێک هـاتووە. بێجگـە لـە شـیعرەکە، هـــەر بەشـــێک هەڵســـوکەوت لەگـــەڵ کۆمـــەڵێک بابـــەتی

هەمەڕەنگی بەچێژی فەلسەفی دەکات. — وە بابەتەکانیش لە خزمەت بیرکردنەوەدان. وەک ئەوەی کە دەبێت وا بن.

# گرینگیی فەلسەفە بۆ هەرێم و کوردستان بە گشتی



ئەم گوتارە لە ڕێککەوتی 10ی 9ی 2023 لە ماڵپەڕی کوردزاگ (kurdzag) پەخش کراوە.

فەلسەفە، بریتییە لە لێکۆڵینەوە لە پرسیارە بنەڕەتییەکانی وەکوو : بوون، زانین، بەهاکان، عەقڵ و چەندین بابەتی مەعریفی دیکە. وە فەلسەفە ڕۆڵێکی چارەنووس–ساز دەگێڕێت لە داڕشتنی کۆمەڵگا و شارستانیەتەکاندا. -- لە جیهانی ئەمڕۆدا فەلسەفە بەهای تایبەتی خۆی هەیە و

بەشێکی زۆر لە بیرمەند و نووسەرانی جیهان بە دوای ئەم بابەتەوەن. چونکە فەلسەفە سەلماندوویەتی کە نەک تەنها لە بواری زانین و مەعریفەتدا بەهێزە و ڕۆڵی دیارە، بەڵکوو بۆ چارەسەرکردنی کێشەگەلێکی کردەکی (پڕاکتیکی)یش سوودی هەیە. -- هەر لە چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکانەوە تا پرسە ڕامیارییە چارەنووس-سازەکان.

فەلسەفە لە هەرێمدا بوارێکی داینامیک و پەرەسەندووە. کە ڕەنگدانەوەی زەمینەی کولتووری و مێژوویی و ڕامیاریی ناوچەکەیە. -- هەرێم و خەڵکی ئەم ناوچەیە، وەک قەوارەیەکی سەربەخۆ لە باکووری عێراق توانیویەتیان ژینگەیەک پەروەردە بکەن کە لێکۆڵینەوەی فەلسەفی تێیدا گەشە بکات و پرسیارەکانی تایبەت بە ناسنامە، مافەکانی مرۆڤ، دیموکراسی و دادپەروەری کۆمەڵایەتی بخاتە ڕوو.

لێرەدا چەند گرینگییەکی سەرەکی فەلسەفە دەخەینە ڕوو بۆ هەرێمی کوردستان و کوردستان بە گشتی :

گرینگیی فەلسەفە لەسەر بڕیاردانی ئەخلاقی:

فەلسەفە چوارچێوەیەک بۆ داڕێشتنەوەی ئەخلاقی و بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە دابین دەکات. ئەمەش وا لە داڕێژەرانی بواری ڕامیاری دەکات لە هەرێمدا بتوانن بڕیاری چاک و درووست پێشکەش بکەن. -- وە بە بەشداریکردن لە فەلسەفەی ئەخلاق، دەتوانن سیستەمێکی ڕامیاری پەرە پێ بدەن کە لەگەڵ بەها و بنەما سەرەکییەکانی کۆمەڵگای کوردیدا هاوتەریب بێت.

گرینگی فەلسەفە لە تیۆری ڕامیاری و یاسایی:

فەلسەفە ئاشنامان دەکات بە تێڕوانینە جیاوازەکانی سیستەمی ڕامیاری و یاسایی. -- وە دەکرێت یارمەتی هەرێم بدات بۆ پەرەپێدان و پالاوتنی پێکهاتەکانی حوکمڕانی

چاک و بەهێز. -- بە خوێندنەوەی فەلسەفەی ڕامیاری بەرپرسانی هەرێم دەتوانن تێگەیشتنێکی قووڵتر لە چەمکەکانی وەک دادپەروەری، ئاسایش، و ڕۆڵی یاسا بەدەست بهێنن. ئەمەش دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی ئاستی هۆشیاری لە بواری ڕامیاریدا.

گرینگیی فەلسەفە لەسەر یەکگرتوویی کۆمەڵایەتی و شوناسی کولتووری :

فەلسەفە بەشداری دەکات لە پەرەپێدانی یەکگرتوویی کۆمەڵایەتی و بەهێزکردنی شوناسی کولتووری لە چوارچێوەی هەرێمی کوردستان و کوردستانی گەورە بە گشتی. — هەرێم بە گەڕان بەدوای نەریتە فەلسەفیەکاندا دەتوانێت هانی بیرکردنەوەی بەهێزتر و جوانتر بدات و گفتوگۆ و بەشداریکردنی فیکری لە نێوان هاووڵاتیانیدا دەستەبەر بکات و کۆمەڵگا لە بوونەوەرێکی بەرخۆر بگۆڕێت بۆ کۆمەڵگایەکی فیکری و بیرمەندانە.

گرینگیی فەلسەفە لە پەروەردە و توێژینەوەدا :

فەلسەفە ڕۆڵێکی چارەنووس-ساز دەگێڕێت لە پەروەردە و توێژینەوەکاندا. — هەرێم بە وەبەرهێنان لە توێژینەوە فەلسەفییەکاندا دەتوانێت نەوەیەکی بیرمەند و توێژەر پەروەردە بکات کە بتوانن بەشداری لە بوارە جیاجیاکاندا بکەن و پێشکەوتنی فیکری لەناو هەرێمدا بەرپا بکەن. هەروەها فەلسەفە دەتوانێت پەیوەندی نێوان زانستەکان بەهێز بکاتەوە و ڕێبازی داهێنەرانە بۆ ئاستەنگە کۆمەڵایەتییەکان دابین بکات. وە لە بواری پەروەردەشدا فەلسەفە دەتوانێت تاکی ئەخلاقمەند و هۆشیار دروست بکات کە هەم دڵسۆز دەبن بۆ هەرێم (کوردستان) و هەمیش بۆ کورد و مرۆڤایەتی بە گشتی.

گرینگیی فەلسەفە لە ئاڵوگۆڕی فیکری و چالاکی دیپلۆماسی :

بەشداریکردن لە گفتوگۆی فەلسەفی و ئاڵوگۆڕی فیکری وا دەکات کارئاسانی بۆ بواری دیپلۆماسی بکات و پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان پەرە پێ بدات. -- فەلسەفە زەمینەیەکی هاوبەش بۆ ئاڵوگۆڕی کولتووری و لێک-تێگەیشتنی نێوان تاکەکان دابین دەکات، ئەمەش وا دەکات حکومەتی هەرێم چالاکانە بەشداری گفتوگۆ جیهانیەکان بکات و بەرژەوەندییەکانی لەسەر شانۆی نێودەوڵەتی بەرەوپێش ببات و بیدرەوشێنێتەوە.

گرینگیی فەلسەفە لە دیدگا و پلاندانانی درێژخایەن :

فەلسەفە هاندەری بیرکردنەوەی درێژخایەن و پلاندانانی ستراتیژییە. حکومەتی هەرێم بە خەریکبوون لەگەڵ چەمکە فەلسەفییەکان دەتوانێت دیدێکی گشتگیر بۆ داهاتوو پەرە پێ بدات، بە لەبەرچاوگرتنی دیدگا جۆراوجۆرەکان و دەرئەنجامە ئەگەرییەکان. -- ئەم ڕێبازە فەلسەفییە دەتوانێت یارمەتیدەر بێت لە داڕشتنی پلان و ڕامیاریی

گەشــــەپێدانی بـــەردەوام کـــە بـــە شـــێوەیەکی کاریگـــەر چارەســـەری ئاســـتەنگەکانی ناوچەکـــە دەکـــات بـــە دەســـتی خودی هەرێمەوە.

دوا وتە:

فەلســـەفە وەکـــوو بابـــەتێکی گـــرینگی جیهـــانی دەمێنێتـــەوە و پێویســـتە لـــە هـــەرێم و کوردســـتان بـــە گشـــتی، بایـــەخێکی تایبـــەتی پێ بـــدرێت چونکـــە خـــاوەنی ســـوودی زۆرە بـــۆ کۆمەڵگا و حوکومڕانی بە گشتی.

## له ستایشی ئێستادا

له ئێستادا پێویسته بگەڕێینەوه سەر بابەته هەنووکەیی و ئێستاییەکانمان. پرسه گرینگەکانی سەردەم چاوەڕێی شیکردنەوەکانی ئێمەن. به خۆ خزاندنه ناو بابەته کۆنەکان و پرسه بەسەرچووەکان، ناتوانین بگەین به هیچ دەستکەوتێکی مەعریفی و زانستی. کەواتا؛ پێویسته سەرنجمان بخەینەوه سەر پرسه گرینگەکانی سەردەمەکەمان. وه بۆ جارێک له ژیانماندا هەوڵ بدەین بیر له ئێستای خۆمان بکەینەوه. له کاتێکدا گرنگه له مێژوو و ئەزموونەکانی ڕابردووی جڤاکێک و سەردەمێک فێر بین، بەڵام دانیشتنمان لەسەر بابەتگەلێکی بەسەرچوو که چیتر پەیوەندییان به ئێستاوه نییه، ڕێگریمان لێ دەکات له هەنگاونانمان بەرەو داهاتوو و تەنانەت ئێستاش. لەبەر ئەوه؛ ئەم پەڕتووکه وەکوو پێویستییەک دەرکەوت. له سەردەمێک که تەواوی سەرنجدانەکانمان لەسەر بابەتەکانی

ڕابردوون، ئەم پەڕتووکە دەتوانێت وەک یارمەتیدەرێک بێت لــەنێو ئــەم جەنجاڵیــەت و چەقبەســتوویەی کــە جڤــاک و کۆمــەڵگاکان لەســەر بابــەت و پرســە کــۆن و نائێســتاییەکان هەیانە.

***

تاکە حیکمەتی ڕاستەقینە ئەوەیە کە بزانیت هیچ نازانیت.

- سوکرات

# بەشی شیعر: هەڵبەستان

## هەستانەوەی نەهێڵ

یەکەم باوەشی بەیانی
پەنجە زێڕینەکانی خۆر و
سرووشتی گەش
بە ڕوومدا کرانەوە

ئەی ڕۆژهەڵات
،خەونەکان لەگەڵ ڕووناکیدا بڕەوێنەوە
جیهان هۆشیار بوویەوە
من هۆشیار بوومەوە

ئاسمان سەری بەرز کردم
ئێستا ئاسمان بۆ من
زەریای هێمنە
ڕەنگدانەوەی ئاسمان
ئاشتییە لە بێدەنگیدا

قیژەی با
لێگەڕێ با سرووشت بئاخڤێ
با گەڵاکان بە هاوسەنگی سەما بکەن
با هاوسەنگی لەدەست نەدەن
گوێبگرە
کزەی با حیکمەتە
حیکمەت بە نەرمی گۆرانی ئەڵێ

گۆرانی ئەو
لە قووڵایی سەری هەڵدا
هاتە بوون
ئەو لە ئازار هاتە ژیان
جوانی لە ئازار هاتە ژیان
من لە ئازار دێمە ژیان

سپێدەی بێدەنگ
بە کزەی با
گەشایەوە
بەڵام دواتر
بوون بە شەپۆل

بەرەو ئاسۆ
ئەمڕۆ شەپۆلەکان
بێدەنگی دەدۆزنەوە
ئەقڵ بێدەنگی دەدۆزێتەوە
تیشک شەو دەشواتەوە
گەڵامێوەکان ڕێگا ڕووناک دەکەنەوە
ئەوان بۆ من
ڕێگا ڕووناک دەکەنەوە

ئەوان بۆ من
ڕێگاکان ڕووناک دەکەنەوە
نەفسەکان
بۆ من
دەتوێنەوە و
ڕاستی دەکەنەوە
ئەوان بە قاقای بەرزەشکۆ دەڵێن
ڕاستی زددی جوانی نییە
ڕاستی
زددی جوانی نییە

- سەرم بەرز کردەوە.
- ئێستا کاژێر دوانزدەی نیوەڕۆیە ...

## نەهێڵ لای جۆگەلەی ماڵیان

دووبارە لە ئاودا
ون بوومەوە
بوومەوە بە خۆم
خۆمیش
بوویەوە بە ئاو

دواتر لە ئاودا
بوومەوە هۆش
پاشان
لە هۆشدا ون بووم
هۆشیش
لەناو ڕووحدا
من لەناو ڕووحدا
بەدوای حەقیقەت دەگەڕێم
ئەمڕۆ بۆ من

دەرگا داخراوەکان دەکرێنەوە
لەنێو ئاوەکەدا سەرم بەرزە
ئەمڕۆ ئاسمان
سەری منی بەرز ڕاگرت

لە پاش ئاسمان
وشەکان هاتن
ئەوان لە باوەشیان گرتم
وشەکان لە باوەشیان گرتم
چرپە دێرینەکانیان
ڕێنمایی هەنگاوەکانم دەکەن
گوتە دانسقەکان
ڕێنوێنیم دەکەن

لەنێو قووڵاییدا
وشەکانیش مانایان لەدەست دا
ئەوسا
لە ناخمدا بوو
کە بەرز بوویەوە
ڕووح بەرز دەبێتەوە

من بەرز بوومەوە
یەقین بە مەبەستەکەی
من بە یەقینەکەم

ئەمڕۆ داری ژیان
خزمەت دەکەم
ئای چ گەوجم
ئێستا داری ژیانیش
خزمەت بە من دەکا
نەهێڵ و شینایی

لە شینایییدا
کێڵگە زەمردەکان دەجوولێن
چرپە نهێنییەکانی ژیان
دەجوولێن
ئەمڕۆ
کێڵگەکان بە ئارامییەوە هەناسە دەدەن
لێی گەڕێ با
کێڵگەکان بە ئارامییەوە هەناسە بدەن

لەوێدا
هەزاران بەرزایی ئامادەن
بەڵام بۆ غەمبارن
ئەڵێن
ئەمڕۆ گیاش ئاخ دەکێشێ
پێم ناخۆشە
گیاش ئاخ بکێشێ

**نەهێڵ لای ئەسپەکان**

سەمای تیشکی خۆری زێڕین
نیگارکێشی جیهان
بە گەرمی و ڕووناکی

پەپوولەکان گەشت دەکەن
باڵەکان بە سێبەری زیندوو ڕازێنراون
هونەری شادی و
زانستی شاد
ئەمڕۆ جیهان دادەپۆشێ

هەور لە سەرەوە،
هەوری شیرین
پێکەنین هەوا پڕ دەکات
ئەوان دەبنەوە بە هەور
دەبنەوە بە خەو
خەواڵووی بەختەوەر
شەپۆلەکان
چرپەی نهێنیی خۆشی
توێکڵی دەریایی
ئەمڕۆ بۆ من
بە خۆشحاڵی درەوشانەوە

کێڵگەی گەنم،
بە ماچی خۆر زێڕین کرایەوە
دڵخۆشی سرووشت
پەردەی لادرا
ئەمڕۆ جوانی
دووبارە ڕازێندرایەوە
نەهێڵ لەلای ئاییندارەکە

ئەمڕۆ
لە باوەشی یوحەننادا
هاتمە دەر
گوڵێکی ناسک
هەڵدانەوەی گەڵاکان
باوەشی نەرمی بەهار

درەوشانەوەی مانگیش
زیوین
لەسەر دەریا
بۆیە ئەکا

وا دەفڕن
باڵە زیندووەکانیان لە جووڵەدان
دڵۆپە باران لە بانەکان
ئاوازی من
دەخوێننەوە

شاخەکان گەیشتنە ئاسمان

پارێزەرانی گۆتەکان

مەزنایەتی

لە بنی ئاودا

ڕەنگئاگریی خۆرئاوا

ماڵئاوا ڕۆژێکی نوێ

سڵاو لە

سەرەتای تازە



هەموو گەوجێک دەکرێ بزانێت، بەڵام ئامانج تێگەیشتنە.

- ئەلبێرت ئاینشتاین (Albert Einstein)

# پێشەکی باسەکانی داگیرکاری

به ناوی خودای بەخشندە و میهرەبان

یەکەم لاپەڕەی ئەم بەشە لە ڕێککەوتی ٢٥ی ٩ی ٢٠٢٣ی نووسراوەتەوە. — لێرەدا دەمەوێت هەندێک قسە بکەم پێش ئەوەی خوێنەر بە قووڵی بچێتە ناو بەشەکە.

ئەم بەشەی لەبەردەم هۆشی خوێنەردایە، بەرهەمی چەندین ساڵەی تێڕامان و بیرکردنەوەمە لە پای کورد و دۆخەکەی. هەروەک خوێنەر ئاگادارە، کورد دووچاری چەندین نەهامەتی بووەتەوە ... بە تایبەتتر لە ئێستادا کە سەردەم بووە بە سەردەمی جیهانگیری و تێکەڵبوونی ڕەنگ و دەنگەکان ... ئەم بەشە پێویست بوو بنووسرێتەوە ...

خوێنەرانی بەڕێز، بەندە هەر لە منداڵییەوە ئاگاداری نەهامەتی و دۆخەکە بووە ... کوردبوون دۆخێکی گەلێک

سەختە ... بەڵام ئەوانەی لە ناو جیهانی باڵادان و خاوەنی ئەقڵانێکی مەزنن، دەزانن کێشەکان هەر ڕووکەشی نین. وە دەزانن کە کێشەکان گەلێک قووڵترن لەوەی خۆیان بە ئێمە نیشان دەدەن.

ئەگەر بە ئاقڵی و بەبێ هەبوونی بیرکردنەوەیەکی ژەهراوی و تەمومژاوی بڕوانینە دۆخەکە، دەبینین لە ڕاستیدا کێشەکە ئەوەندە پابەندە بە تاکی خۆمانەوە، پابەند نییە بە خودی گەورەکان و سەرکردەکان و پارتە ڕامیارەکانمان ... لێرەدا هەوڵ دەدەم تاکی کورد بگەڕێنمەوە بۆ ناو هۆشی خۆی و خۆی بخەمەوە ژێر بەهای بەرپرسیاریەتی ...

بیرمە کاتێک منداڵ بووم هەر دەیانگوت کێشەکان پارەن ... کێشەکان ئەوەن ... کێشەکان ئەوە نین ... کە تەمەنم بوو بە بیست و سێ ساڵ و کەوتمە ناو ژیانی گەوراتی و هۆشمەندییەوە، زانیم لە ڕاستیدا کێشەکان هەرگیز ئەوانە

نین کە کۆمەڵگا باسیان لێوە دەکات ... واتا کێشەکان لە ڕاستیدا پەیوەندییان بە خودی برینەکەوە نییە ... دەستنیشانکردنی کێشەکانمان هەڵەیە ... ئێمە هەڵەمان لە دەستنیشانکردنی کێشەکان هەیە ... ئەم بەشە بەرهەمی هەڵەکردنە لە دەستنیشانکردنەکانماندا ...

کورد وەکوو هەر میللەتێکی دیکە و نەتەوەیەکی دیکە خاوەنی هۆز و هۆش و شووناس و بوونی خۆیەتی ... وە ناشێت ئەم بوونەی لێ بستێندرێتەوە ... هەر هەوڵێک بۆ سڕینەوەی ئەم گەلە مەزنە مەحاڵ و ئەستەم بووە لە ڕابردوودا ... بەڵام لە سەردەمی ئێستاماندا، داگیرکردنی کورد و داگیرکردنی خۆمان کەوتە ناو قۆناغێکی نوێوە ... کەوتە ناو قۆناغێکی دیکەوە کە بە نەرمە هێز و جەنگی دەروونی و هێرشی ناڕاستەوخۆ ناسراوە ...

له ڕاستیدا ئەم جۆرە هێرشانە هەر لە کۆنەوە هەبوون ... بەڵام بە ڕادەی ئێستا نەبوون ... لە ئێستادا ئەگەر ڕەشبین نەبم لە قسەکردندا ئەوا چرکە بە چرکە ئێمە هێرشی لەم جۆرانەمان دەکەوێتە سەر کە بە هێرشی ناڕاستەوخۆ و نەرمە هێز و جەنگی دەروونی ناسراون ... کەواتا یارییەکە کەمێک سەختە بۆ کەسانێکی لاواز و هەژار و کەمدەرامەت کە بەداخەوە دەبێت بە زۆرەملێیانە بەرگەی ئەم ژیانە بگرن ...

لەم بەشەدا هەوڵم داوە بە سادەترین شێواز بابەتەکان ڕوون بکەمەوە. بەڵام پێویستە خوێنەری بەڕێز ئەوە بزانێت کە پێویست بە هۆش و بیرکردنەوەیەکی پاکەوە ئەم بەشە بخوێنێتەوە و زۆربەی بیرۆکە چەقبەستووەکانی فڕێ بدات ...

بەڕاستی ئەم بەشە لەوانەیە بەشێکی زۆرمان دڵگران بکات سەبارەت بەوەی کە ڕاستییەکان ئاشکرا دەکات ... بەڵام خوێنەر دەبێت دڵنیا بێت کە ئەگەر هەر کێشەیەک لە کێشەکانی ناو ئەم بەشە لەنێو هیزری خۆیدا بینییەوە ئەوا دەبێت بزانێت هەنگاوی یەکەمی چارەسەرکردنی بریتییە لە دەستنیشانکردن و قبوولکردنی کێشەکە و قبوولکردنی هەبوونی کێشەکە ... نەوەکوو پەردەپۆشکردنی کێشەکە کە وەک ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێت ... ئەگەر خوێنەر لە هەر بەشێکی ئەم بەشانەدا هەستی بە نارەحەتی کرد و وای زانی وەکوو هێرشێک وایە بۆ سەر بوونی، ئەوا دەبێت خوێنەر لەم کاتەدا هەست بەوە بکات کە ئەمە هەر تەنها سەرەتایەکە بۆ گۆڕانکاریکردن لە ژیانی خۆی بۆ بەرەو باشتربوون و بەرەو گەشبوونەوە ...

# پوختە

+ هەرگیز بۆ پارە کار مەکە بەڵکوو بۆ دڵخۆشی خۆت کار بکە.

+ پارە بکە ئامڕازێک بۆ گەیشتن بە حەز و ئارەزووە چاکەکانی ناخت.

+ مەهێڵە پارە بەکارت بهێنێت و لە ئیشقی پارە هەمیشە خۆت بە دوور بگرە.

+ بۆ ژیان هەوڵ بدە و پارە بۆ ژیان بەکار بهێنە نەوەکوو هەمیشە بە دوای پارەوە بیت.

+ ئەگەر پارەت هەبوو، خراپ نییە هەندێک جار بیبەخشیت. لە پارە بەخشیندا هەرگیز ڕەزیل مەبە.

## باسەکە

"هەموو سەروەتێک بەرهەمی کارە". — جۆن لۆک

پارە بریتییە لەو سیحرە شاراوەیەی کە ژیان بەڕێوە دەبات ... بەڵام پارە عادەتێکی سەیری هەیە، ناکرێت باس بکرێت و هەمیشـەش نهێنییـە ... زۆربـەی ژیانمـان لـە ڕێگـەی پـارەوە هەڵدەسـووڕێت بـەڵام هیچ کەسـێک بـوێری ئـەوەی نییـە پرسیاری لێ بکات ...

زۆرجار لە کارکردندا ناتوانین پرسیاری بڕی پارەکە بکـەین ... یاخود هەندێک جـار کەسـەکان نرخـەکان نـاڵێن ... چونکـە بەشـێکی زۆری تاکـەکانی کۆمـەڵگا دەزانن پـارە لـە ڕاسـتیدا شـەیتانێکی نـەفرەت لێ کـراوە کـە بەرەبـەرە ژیانیـان داگیر دەکات و دەیانخوات ...

کـوردیش وەکـوو هــەر نەتــەوە و کیـانێکی دیکـە تووشــی نەخۆشــی ئاشــقەپارە بـوو ... جیاوازییـەک هەیـە لـە نێـوان کارکردن بۆ ژیان و کارکردن بۆ پارە ... کورد لـە خانـەی یەکەمدایە نەک دووەم ...

بەداخـەوە کـوردیش وەکـوو هـەر میللـەتێکی دیکـە، زۆر بـە جوانی جۆش دراوە بە پارە ... لـە ئێسـتادا بەشـێکی زۆری کـورد هــەموو فکـری لەســەر پارەیــە ... هەڵبەتــە ئەمــەش دەگەڕێتــەوە ســەر هــەبوونی چەنـدین کێشــەی نـاوخۆیی و دەرەکی کـورد ... بـەڵام لـە ڕووی دەروونزانیشـەوە، خـودی تاکی کورد، قوربانی دەستی ڕابردوویەتی ... نەتەوەیەک کـە لـە ڕابـردوودا دووچـاری ناخۆشـی و نەهامـەتی زۆر بـووە، ناچارە لە ئێستادا ئاوا بکات ...

بۆ وێنە: کاتێک لـە ڕابـردوودا کـورد میللـەتێکی هـەژار بـوو، هــەموو هــەوڵی بەدەســتهێنانی موڵـک و سـامان بـوو ... بـۆ

ئەوەی ئازاری هەژاری کەم بکاتەوە ... بەڵام لە ئێستادا ترسی کورد گەڕانەوەیە بۆ ئەو ئازارە ناخۆشەی کە هەژاری هەیبوو لەسەری لە ڕابردوودا ... لەبەر ئەوە، کورد بە ناچاری بە دوای پارە دەکەوێت وەکوو ترسێک کە هەیەتی ... ترسی هەژاری کورد ڕەزیل و چاوچنۆک دەکات ...

بەڵام بە داخەوە خەونی ساختە و ڕووکەشمەندی دەوڵەمەندی و ژیانی ڕاقی کوردی خستە چەقی دۆزەخەوە ... لە ئێستادا لە کوردستان وەکوو هەر وڵاتێکی دیکە، کورد هەموو هۆشی لەسەر پارە داناوە ...

ئاشقەپارە نەخۆشییەکی کوشندەیە، ئەگەر خوێنەری بەڕێز تووشی بووبێت دەزانێت کە چەندە ترسناکە ... ئێمەش ئاوامان لێ هاتووە! لەبیرمە هەندێک جار لە ژیانمدا هەوڵدانم بۆ پارە چی لە خەون و تەندرووستیم کرد ... منی

خستە بنی دۆزەخ ... چونکە ڕاستییە تاڵەکە ئەوەیە: پارە هەرگیز ناتگەیەنێت بە دڵخۆشی و ئیسراحەتی ...

بیرم کردەوە پارە چییە ... لە سادەترین وەڵامدا، پارە بریتییە لە کات. چونکە پارە کاتێکی زۆرت بۆ دەگەڕێنێتەوە. بیر بکەوە کاتێک خۆت ناتوانیت پێڵاوێک چاک بکەیت، ئەوا ناچاریت بە کەسێکی دیکە بیکەیت ... لێرەدا ئەگەر خۆت هەوڵی چاک کردنەوەی پێڵاو بدەیت ئەوا کاتێکی زۆرت لێ بەفیڕۆ دەدات و ڕەنگە خۆشت حەزت لە کارەکە نەبێت ... بێجگە لەوە هیچ گەرەنتییەک لێرە نییە وات لێ بکات چاککردنەوەکەی تۆ باشتر بێت لە هی ئەوانەی کە بە دەیان ساڵ ئەزموونیان لەم کارەدا هەبووە. — لەبەر ئەوە پارە کاتێکی زۆر بۆ مرۆڤ دەگەڕێنێتەوە ...

ڕاستگۆ بین لەگەڵ خۆمان، جەنگی سەرەکی ژیان لەسەر خودی کاتە. کات دراوی ڕەسەنی گەردوونە -- کات

دراوێکی گەردوونییە و ڕاستەقینەتریشە. بیر بکەوە ئەگەر مرۆڤ کاتی نەمێنێت ناتوانێت هیچ بکات. ئەگەرچی پارەشی هەبێت ... وە زۆرجار پارە ناتوانێت کات بکڕێت.

لەبەر ئەوە مرۆڤی ژیر و هۆشمەند هەمیشە هەوڵ دەدات پارە بۆ کات تەرخان بکات ... هەر وەکوو ئاماژەم پێ دا، کات دراوی سەرەکی گەردوونە. پێویستە پارە پەیدا بکەین هەتاوەکوو کات بەفیڕۆ نەدەین ... پێویستە کار بکەین بۆ ئەوەی ئیسراحەت بکەین ...

بەڵام ئایە کورد ئەمە دەزانێت؟ ... بێگومان نەخێر. کورد لە ئێستادا پارە بۆ پارە پەیدا دەکات و نازانێت هەر بۆچی کار دەکات ... لەبەر ئەوە، خودی پارە مانای لەدەست دا و زۆربەی زۆری ئیشەکانیش مانایان نەما. — هەر وەک دەزانن ئامانج لە ئیشدا زۆر گرینگە. میللەتێک کە ئامانجی لە پەیداکردنی پارەدا نەبێت مایەپووچ دەبێت. ئەمەش

هۆکاری سەرەکییە وا لە کورد دەکات هەمیشە هەژار بێت. ئەو ئابووری-ئاسا لە دۆخەکان ناڕوانێت ...

هەر لە سەردەمی منداڵیمەوە، دەمبینی چۆن زۆربەی خەڵک وێڵی پارەیە ... دەمبینی زۆربەی تاکەکان هۆش و ئەقڵیان لە مێروولەیەک بچووکترە ... دەمبینی کەوا چۆن تاکی کورد خەونی نەبوو ... تاکە خەون پارە بوو کە بوونی نەبوو ... لە منداڵییەوە هەستم دەکرد ئێمە بێجگە لە دانیشتوانێک هیچی دیکە نین. — هیچ خەونێک ئێمە کۆ ناکاتەوە ... وە خەیاڵمان کرایە قوربانی پارە و ژیانی ساختە ...

لەبیرمە کاتێک منداڵ بووم لە قوتابخانە بە قەڵەمی ڕەنگاوڕەنگ وێنەمان دەکێشا ... مامۆستایەک لە ڕەگەزی مێ هاتە ژوور و سەیری وێنەکانی کرد و بە گاڵتەئامێزانەوە گوتی: ئەمە سوودی چییە ؟ ... بەڕاستی قسەکەی زۆر دڵشکێنەر بوو. چونکە ئێمە منداڵ بووین و

حەزمان لە خەون و خەیاڵ بوو ... بەڵام تێبینی بکەن چۆنی تاکی بەتەمەنی کورد بە دەستەواژەی سوود و ناسوود دۆخەکان هەڵدەسەنگێنێت ... نەوەکوو بە ڕێگایەکی جوانیناسی و هونەردۆستی ... -- لێرەدا دەمەوێت ئاماژە بەوەم بکەم چۆن پارە خەون و خەیاڵی تاکی کوردی کوشت. هەر لە منداڵییەوە پێیان گوترا هیچ تشتێک مەکەن کە لە دژی سوود و قازانج بێت ... وە هەمیشە هەوڵ بدەن بەسەر گشت تاکێکدا سەر بکەون بۆ بەدەستهێنانی گوێ سۆرەکان (ئاماژەیە بۆ بیست و پێنج هەزار دیناری عێراقی) ...

بە داخەوە لە منداڵییەوە تاکی کورد زەختێکی کوشندەی لەسەرە بۆ سەرکەوتن و بەدەستهێنان و قازانج ... ئێمە تووشی هەمان دەردی منداڵی چینی و ڕۆژهەڵاتی باشووری ئاسیا بووین. -- ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ دایک و باوکەکان کە دەیانەوێت هەمیشە منداڵەکانیان لۆرد و پادشا

بن و دەوڵەمەنـد بن ... بـەبێ ئـەوەی گـوێ بدەنـە بـەها و خـەونی خـودی منداڵەکـە ... لـە کوردسـتاندا هـەموو دایـک و باوکێک دەیەوێت منداڵـەکانی ببن بـە موهەنـدیس (ئەنـدازیار) یـــاخود دکتـــۆر و تشـــتی گەورەگـــەورە ... لـــە ڕاســـتیدا دووڕووییەکە لەوەیە دایک و باوکەکان ئەم کـارە ناکـەن بـۆ ئەوەی کۆمەڵگا و کورد باشتر بێت ... نـەخێر، بـەڵکوو تـەنها و تەنها بۆ بەدەستهێنانی گوێ سۆرەکانە ...

بەداخەوە ببینن چۆن پیشەی دکتـۆر و ئەنـدازیار و چەنـدین پیشـەی پیرۆزی هاوشـێوەی دیکـە سـووک کـران و ئاسـتیان لە هاریکاری میللەت دابەزێنـدرا بـۆ بـەهای پـارە ... پێویسـتە خۆمان لە وەسوەسە بپارێزین.

کار بکە بۆ دڵخۆشکردنی خۆت نەک بۆ پارە.

عەلی ئەحمەد

# پارە بۆ ئافرەت

ئەگـــەرچی لـــە گوتـــاری ڕابـــردوودا بـــەبێ ڕەچـــاوکردنی ڕەگـــەزەکان قســـەم کـــرد، بـــەڵام لـــەم گوتـــارەدا ســـەرنجی سەرەکی دەخەمە سەر ڕەگەزی مێ.

بەداخـەوە لـە کوردسـتان وەک هـەر وڵاتێکی دیکـە، بەشـێکی زۆری ئافرەتـــەکانی هەڵخەڵەتێنـــدران بـــۆ پـــارە. -- پیـــاوە پیســـــەکانی وڵاتـــان توانیـــان ئـــافرەتیش بـــەکار بهێنن بـــۆ بەرزکردنـــەوەی پارەکانیـــان ... لـــە ئێســـتادا بەشـــێکی زۆری ئافرەتـــانی جیهـــان بـــەکار دەهێنـــدرێن بـــۆ بەدەســـت هێنـــانی پارە ...

بە تایبەتتر لە ڕووی پیشـەییەوە، هـەر وەک دەزانن بەشـێکی زۆری ئافرەت داندراون لە دامەزراوە و دەسـتگا و هـەزاران شـــوێنی دیکـــە، کـــە بەڕاســـتی خـــودی ئـــەم کارانـــە لەگـــەڵ

سرووشتی ڕەگەزی مێدا ناگونجێن ... بەڵام با بزانین کێشـە سەرەکییەکە چییە.

مرۆڤی نەزان و گەمژە وای لە ئافرەت گەیاندووە کـە ئەگـەر پارە پەیدا نەکەن ئەوا سـووک و ڕیسـوا دەبن ... لـە ئێسـتادا پـارە لـە پێشـینەکانی ئافرەتانـە. دڵخۆشـی لـە دوای پـارەوە دێت ...

بەڵام بەداخەوە ئـەم ئاشـقەپارەیە وای لـە ئافرەتـان کـردووە کە تشتانێک بکەن ڕقیان لێیەتی و تەنانـەت ناشـتوانن بیکـەن بەڵام ناچارن بیکەن لەبەر پارە. -- کورد گوتەیـەکی جـوانی هەیە کە دەڵێت: کەسـی شـیاو بـۆ شـوێنی شـیاو ... ئەمـە بـۆ ئافرەتان بوونی نییـە چونکـە لـە جیهانـدا ئێسـتاکە ئەوەنـدەی پاداشتی جوانی دەدرێتەوە پاداشتی ئەدای کار نادرێتەوە ...

تەماشا بکەن لە ڕابردوودا ئافرەتانمـان کارگـەلێکیان ئـەنجام دەدا کە لەگەڵ بوونی خۆیاندا دەگونجان. ئەوان ئارام بـوون لەگەڵ کارەکانیان. بەڵام ئێستا لەبەر چاولێکەری و هۆشـیار نـەبوون، بەشـێکی زۆری ئافرەتـان هـەوڵی کۆمـەڵێک کـاری ڕەگەزی نێر دەدەن کە هەرگیز دڵخۆشیان ناکات.

لە ئێستادا لەبەر ئەوەی پارە بـوو بـە داگیرکـارێکی دڵ ڕەق، کۆمـەڵێک بەربەسـتی درووسـت کـرد بـۆ پـەروەردەکردنی ئافرەتـانێکی چـاک. ئەمـەش وای کـرد ڕێ بـە کۆمـەڵێک مـێی خـــراپ بـــدات لـــەناو کـــاری مۆدێـــل و ئـــەم و ئـــەو و بڵاوکردنەوەی جەستەدا بەشدار بن.

بـەڵام پێویسـتە دووبـارە ڕەچـاوی ئـەو دۆخـە بکـەین کـە لـە نێوان ڕەگەزی مێ و پارەدا بوونی هەیە.

# ئامۆژگارییەکان

+ هیچ کاتێک لە ژیانت هەوڵ بۆ پارە مەدە.

+ پارە بەکار بهێنە بۆ ژیانی خۆت. نەوەکوو پارە بۆ پارە بەکار بهێنیت.

+ ئەگەر زانیت هەوڵدانەکانت بۆ پارە، هەموو هەوڵدانەکان پاشگەز بکەرەوە و پاشان بە خۆتدا بچۆرەوە.

+ هەرگیز پارە قبووڵ مەکە بۆ کردنی تشتێک کە ڕقت لێیەتی.

+ هەرگیز کارێک مەکە کە ڕقت لێیەتی بۆ بەدەست هێنانی ژیانێک کە لە مستەوای خۆتدا نییە.

هەموو ئامۆژگارییەک وەربگرە.

عەلی ئەحمەد

# دوا وته

دەمەوێت ئەوەتان بە بیر بهێنمەوە کە پارە ئامرازێکی خراپ نییە و بەسوودە. بەڵام بزانن چۆن پارە داگیرتان دەکات و هەوڵ دەدات مرۆڤایەتیتان بخەسێنێت ... سەیر بکەن بەشێکی زۆری کێشەکانی ژیان لەسەر پارەیە و کەسانێکی کەم هەن هەوڵی ئەم ژەهرە نەدەن و ئامادە بن تەنانەت بە خۆبەخشیش کار و چالاکییەکانی خۆیان ئەنجام بدەن. دروود بۆ ئەوان.

دەمەویت دووپاتی بکەمەوە من هەرگیز لە دژی بەرهەمهێنان و دەستکەوت و سەرکەوتندا نیم ... بەڵام بزانن بەشێکی زۆری دەستکەوت و پارە و سەرکەوتنەکانمان دەمان گۆڕن و دەمان کەن بە مرۆڤانێکی ڕۆبۆتیکی و ئالەتی ...

لە سەرکەوتن بترسە چونکە ئەوسا شەیتان بۆت دێت.

عەلی ئەحمەد

# بەشی دووەم : ئیش

پوختە

نەویستنی ئیش

ترس لە ئیش

ئامۆژگارییەکان

دوا وتە

# پوختە

ئیش سەرەکیترین چالاکییەکانی مرۆڤە و پێویستە هەموو تاکێک خۆی تیایدا بدۆزێتەوە ... وە هەرگیز تاک هەوڵ نەدات کارێک بکات کە لە خۆی نایێت و پەیوەندی بە خۆیەوە نییە ... وە هەرگیز کارێک بە زۆرەملێ نەکات. چونکە تاک پێویستە دڵی بە کارەکەی خۆش بێت. ئینجا ئەگەر کەسێک نادڵ بێت لەگەڵ کارەکەیدا ئەوا پێویستە ئەو پیشەیە ئەنجام بدات کە لە نزیکترین حەز و ئارەزووە چاکەکانی نزیکە.

لەم بەشەدا سەرنج دەخەمە سەر چەند ڕەهەندێکی ئیش. کە دەبێتە بەرچاوڕوونی بۆ خوێندنەوەی کار و پیشەکان لە ژیانی ڕۆژانەی تاکێکدا. — پیشە هەمیشە یەکێکە لەو بوارانەی بە پەلەپەلی و نەزانی دەچینە ناوی، بەڵام ئێستا کاتی ئەوە هاتوو خوێندنەوەیەکی ڕەخنەیی بۆ دەستەبەر بکەین.

# نەویستنی ئیش

بە داخەوە لە جیهانی مۆدێرنیتە و ئاڵۆزی ئێستادا، بەشێکی زۆر لە تاکەکان ڕقیان لە کارەکانی خۆیان هەڵگرتووە و زۆربەی تاکەکان دەیانەوێت واز لە کارەکانیان بهێنن بۆ کارێکی دیکە کە داهاتەکەی باشترە یاخود هەر کار نەکەن ...

سەیر بکەن چۆن کەسانێک کە خیانەتیان لە بوون و ژیان کرد، چۆن وایان لە تاکەکانی کۆمەڵگا گەیاند کە هەرگیز کار نەکەن و خزمەت نەکەن ... ئەوان وایان کرد تاک هەمیشە هەست بەوە بکات کە لە هۆزەکەی خۆی گەورەترە ... ئەگەرچی ئاواش نەبێت ...

بەشێکی دیکەی خەڵکیش بێزارن لە کارەکانیان چونکە دەبینن ئەم کارانەیان برسییەتییە ڕووحی و جەستەییەکانیان پڕ ناکاتەوە ... مەزندە بکە کەسێک بۆ

دوازده کاتژمێر لە ئۆفیسێکدا بێت چی لێ بەسەر دێت؟ ... بەشێکی زۆر لە کارەکانی مۆدێرنیتە هۆشی مرۆڤ تێک دەدەن و دەروونی دەڕووخێنن ...

وەکوو تاکێک، لەلام سەیرە کە دەبینم بەشێکی زۆری کۆمەڵگا کارگەلێک دەکەن خودی خۆیشیان ڕقیان لێیەتی ... ئاخر چۆن دەکرێت تاکێک خۆی نەبێت؟! ... کاتێک گوێبیستی ئەوە دەبم لەلایەن تاکێک زۆر لام سەیر دەبێت ... کە دەڵێن "من حەزم لە کارەکەم نییە" ... لێرە پرسیارێکی جددی و سەرەکی هەیە ... ئەی لەبەرچی وازی لێ ناهێنێت؟ ... هەندێک ئەکشن (کردار) بوێری دەوێت ... بەڵام بە داخەوە وا دیارە ئێمە بوێر نین.

ئێمە ئامادەین تشتگەلێک بکەین ڕقمان لێیانە بەڵام هەر دەیان کەین لەبەر زگمان و لەبەر ترسان و لەبرسان مردن ...

خودی مرۆڤ ئاوایە هەمیشە لە ترسدا دەژییێت. هەمیشە ترسی لە بەیانی خۆی هەیە. ترسی لە زگی هەیە. ترسی لە خێزان و خانەوادە و دۆست و ناسیاوەکانی هەیە ... مرۆڤ لەناو ترسدا دەژییێت ... مرۆڤێک لەناو ترسدا بژییێت، بوێر نییە.

لەبەر ئەوە، نەویستنی ئیش بەڕاستی بیرکردنەوەیەکی ڕاست و ڕەوانی دەوێت و تشتێکی هەوەنتە نییە. ناکرێت مرۆڤ بە هەموو کارێک ڕازی بێت. بە تایبەتتر ئەگەر خودی تاکەکە ڕقی لە کارەکە بێت ... ئەگەر تاکێک ڕقی لە کارێک بوو هەرگیز نابێت بیکات چونکە هەم کارەکەش تێک دەدات و هەمیش دڵی خۆش نابێت ئەگەرچی پارەکەشی زۆر بێت.

بە باوەڕی خۆم هەموو تاکێک حەز بە کار دەکات و هەرگیز لە ژیانمدا تاکێکم نەبینیوە کە هەر هیچ نەکات ...

بەڵام کێشەکە ئەوەیە بەشێکی زۆری تاکەکان ڕاستگۆ نین لەگەڵ خۆیان و هەمیشە کارێک دەکەن کە ڕقیان لێ بێت ... ئەمەش وا دەکات هەتا ماون تف لە ژیان و خاکەکەیان بکەن. بەڵام دەبێت ئەوە بزانین بەشێکی زۆری غەمەکانمان لە ئەنجامی هەڵبژاردنە هەڵەکانی خودی خۆمانە ...

هەرگیز کارێک مەکە ڕقت لێی بێت.

عەلی ئەحمەد.

# ترس لە ئیش

ڕقێکی دیکە لە ئیش بریتییە لە ترس لە ئیش. بەڵام با بزانین ئەم ترسە چلۆن درووست بوو و هاتە کایەوە ...

بە داخەوە لە کۆمەڵگای ئێمەدا، بەشێکی زۆری تاکەکان ترسێکیان بەرامبەر بە ئیش هەیە ... بە تایبەتتر چینی گەنج و هەرزەکار کاتێک دەبینن باوانیان هەر لەناو ناخۆشی و ڕەزالەتی کارکردندا بوون، ئەم دیمەنە وای کرد ئەم گەنج و لاوانە بترسن لە ئیش ... وە وا مەزندە بکەن کە ئیش هەمیشە ئاوا ناخۆش و دڵڕەقانەیە ... بەڵام لە ڕاستیدا وا نییە ... ئیشکردن دەکرێت خۆش بێت و دەکرێت بە چێژ بێت. تەنها لەبەر ئەوەی جۆری کارکردنی کورد یان هەر میللەتێکی دیکە لە ڕابردوودا خراپ و مەینەتی بووە مانای ئەوە نییە کە هەر دەبێت ئاوا بێت ... سوپاس بۆ خودا لە جیهانی ئێستاماندا گشت ئامرازێکی کارکردن بە هەزاران

پلـە بـەرز بووەتـەوە و گـەلێک چـاکتر بـووە لـە ئـامڕاز و ئالەتەکانی ڕابردوودا ... کەواتا هیچ بەهانەیەک بوونی نییە ئەگـەر بمانـەوێت گـرانی و قورسـی کـارکردن بکـەین بـە بەهانەیەک بۆ کارنەکردن ...

وە بە داخەوە لە کۆمـەڵگای ئێستادا ئیش و مانـدووبوون و جددییەت لە کارکردندا هەرگیز پاداشـت نادرێنـەوە ... لێرەدا ئەجێندایەکی ترسناک خۆی حەشـار داوە ... ئێسـتا بەشـێکی زۆری کۆمپانیـا و پڕۆژەکـان کەسـانێک بانـگ دەکـەن کـە جـوان و سـەرنج ڕاکێش بن نـەوەکوو خـودی کارەکـە بـزانن ... ئەمـە هۆکـاری سـەرەکی ڕووخـان و داڕمـانی بەشـێکی زۆری پڕۆژەکـان و کۆمپانیاکانـە ... کۆمپانیـا و پڕۆژەکانمـان لەبـەر ڕازیکـردنی دڵی ناسـکی کۆمپانیـا و پڕۆژە زەبەلاحە ترلیۆن دۆلارەکانی دیکە، ئامادەن هـەموو تشتێک بکەن ... ئەگەر ئـەو تشـتەش بریـتی بێت لـە داڕمـانی بەها و نامووسی (نۆمۆس) کۆمەڵگاش ...

بەڵام با لێرەدا بگەڕێینەوە سەر باسە سەرەکییەکەمان و هێرشەکانمان بۆ سەر کۆمپانیا زەبەلاحەکان ڕابگرین ... بەداخەوە تاکی ئێستا نایەوێت ماندوو بێت ... وە نایەوێت هەوڵ بدات. ئێمە بووین بە کۆمەڵگایەکی بەرخۆری زۆرخۆر. لە کاتێکدا وڵاتانی دیکە نان نییە بیخۆن و لە برساندا دەمرن، ئێمە هەمیشە هەوڵ دەدەین هەر بخۆین و بخۆینەوە هەتا دەمرین. ئێمە ڕێز لە جەستەشمان ناگرین ... بەڕاستی ئەگەر ڕاشکاوانە بیڵێم، ئێمە ترسمان لە ئیشە چونکە ئیش لە دژی تەمبەڵی خۆمانە.

ئەگەر ڕاستگۆ بین لەگەڵ خۆمان دەبینین مووچە و داهاتی مانگانە چی لە میللەت کردووە ... مووچە کۆمەڵگای تێک داوە. چونکە هەموو تاکێک هەوڵ دەدات مووچەیەکی هەبێت ... واتا فەرمانبەر بێت ... واتا دەیەوێت هیچ نەکات ... بەڵام بە داخەوە تاک هۆشی ئەوەی نییە کە ئەگەر مووچەشی

نـەبێت هـەر دەتـوانێت کارێـک بکـات ... بـەڵام ئێمـە بـوێری کارکردنمان نییـە ... لـە ئێسـتادا کـورد ئیشـکەر نییـە. بـەڵکوو مووچەخۆرە.



هەفتەی ڕۆژێک کار مەکە.

عەلی ئەحمەد.

# ئامۆژگارییەکان

+ هــەرگیز بــە کــاری ئــەوانی دیکــەوە سەرســام مەبــە و هەڵمەخەڵەتێ بە ڕووکەشی کاری ئەوانی دیکە. مـەرج نییـە ئەوانـەی لـەو کارانـەی کـە داهاتییـان زۆرە دڵخـۆش بن بـە کارەکەیان و ڕەنگە نیگەرانیش بن.

+ هەمیشە شانازی بە کارەکەت بکە ئەگـەرچی داهاتەکەشـی کەم بێت.

+ هەرگیزەوهـەرگیز کارێـک مەکـە ڕقت لـێی بێت یـاخود بـە زۆرەملێ و بە تۆبزی ئەم کارە بکەیت ... کارێک بکە حـەزت لێی بێت ئەگەرچی داهاتەکەیشی کەم بێت.

+ کارێـک بکـە ئامـادە بیت بـە خـۆڕاییش بێت هـەر بیکـەیت. چونکە ئەوەندە دڵت پێی خۆشە.

+دڵخۆشی لەو کارەدا بدۆزەوە کە دڵت دەیخوازێت.

# دوا وته

لە دوا وتەی ئەم بەشەمدا دەمەوێت بڵێم هەرگیز کارێک مەکەن ڕقتان لێی بێت و واتان لێ بکات دژی ژیان ڕەفتار بکەن. وە هەرگیز کار بۆ پارە مەکەن. کار بۆ دڵخۆشی خۆتان بکەن. وە هەرگیز حەسوودی و بەخیلی بە کاری ئەوانی دیکە مەبەن ... تەنها سەرنجتان لەسەر کاری خۆتان بێت ... وەکوو ئەو قسە جوانە عەشائیریەی کە دەڵێت: عارەبانەی خۆت باژۆ و بڕۆ! ... واتا کاری خۆت بکە و سەرنجت لەسەر کاری ئەوانی دیکە نەبێت.

کار بکەن بۆ دڵخۆشی خۆتان و لە بیرتان بێت هەموو کارێکیش پیرۆزە و هەرگیز مەهێڵن ڕووحتان بفرۆشن بۆ پارە و پلە و پۆست.

وردەكارییەكان گیرنگن، وە شایەنی ئەوەن چاوەڕێیان بکەین.

— ستیڤ جۆبس

# پوختە

لەم بەشەدا هەوڵ دەدەم بە کورتی باس لە زگ بکەم. پەیوەندی زگ بە مرۆڤ و دەرکەوتەکانی. — هەر وەک ڕوون و ئاشکرایە زگ پاڵنەرێکی سەرەکییە لە ژیانی مرۆڤدا. مرۆڤ بۆ زگ هەوڵ دەدات. وە زۆربەی کات زگ سەرکەوتوو دەبێت بەسەر دۆخەکاندا. لێرەدا پێویستە سەرنجێکی کورت بخەینە سەر زگ بۆ ئەوەی خۆمان بە دوور بگرین لە فێڵە ناحەزەکانی.

— ڕەنگە بەشێکی زۆری خوێنەران ئاشنای ئەوە نەبن کە بەڵێ زگ خاوەنی سەربەخۆیی خۆیەتی. وە لە کاتی برسیبووندا هێرشمان بۆ دەبات. بەڵام نابێت ئەوە لە بیر بکەین کە زگ زۆرجار فێڵبازیشە، وامان لێ دەکات هەست بە برسییەتی بکەین لە کاتێکدا برسیش نەبین. ئەمەش بۆیە وامان لێ دەکات خواردنی خراپ بخۆین و بخۆینەوە.

## باسەکەمان

زگ مرۆڤ دەکوژێت. بە تایبەتتر لە سەردەمی ئێستای خۆماندا، زگ هۆکاری زۆرترین ڕێژەی نەخۆشییە ... ئەگەر مرۆڤ ڕۆژانە ئەو تشتانە بخوات کە ڕێکلامیان لەبۆ دەکرێت و دەخرێنە پێش چاوی، ئەوا بێشک دەمرێت ... ئێمە خواردنەکانمان تەندرووست نییە. ئەم هەواڵە نوێ نییە و گەلێکمان ئاگادارین ...

بەلام بێجگە لە خواردنی ناتەندرووست و خراپ، مرۆڤ پێویستە ئەو ترسەی ناخی بڕەوێنێتەوە کە هەمیشە داوای برسییەتی لێ دەکات. هەمیشە داوای لێ دەکات برسی دەربکەوێت ... ترس لە لەبرسان مردن گەلێک بەربڵاوە ... دەڵێن گوایە با کەسێک هەوڵی زانست نەدات چونکە دەمرێت لە برسان ...

زگ پێویستە خزمەت بە جەستە و پاشان بە هۆش بکات.

نەوەکوو بێین هۆش و جەستە لە خزمەتی زگدا جۆش بدەین.



# ئامۆژگاری

+ هەرگیز بۆ زگ هەوڵ مەدە چونکە زگ گەورەترین مەترسییە لەسەر تەندرووستی مرۆڤ.

+ زگ بێجگە لە جەستەی مرۆڤ، تشتی دیکەش دەگرێتەوە، هەرگیز هەوڵ بۆ پارە و داهات مەدە. با ئەوان خۆیان بۆت بێن.

+ یارمەتی ئەو کەسانە بدە کە هەژارن و خواردنی پێویستیان لا نییە. دڵنیا بە کەسانێکی زۆر هەن لەسەر ئەم زەوییە کە لە ژێرەوەی ڕەحمی تۆدان.

+ لە بیرت بێت، کەم بۆ خۆت، زۆر بۆ ئەوان. — هەرگیز ئەوان لەبیر مەکە، ئینجا <ئەوان> هەر کامەک بن.

ژیان کورتە و پیشەکەش درێژ.

— هیپۆکراتس

# ئەڵگۆڕیتمەکانی خراپەکاری



§ ۰ :

<ئاڵگۆڕیتم> = خەواریزمەکان. وە خەواریزمەکان + خراپە = ئەڵگۆڕیتمی خراپەکاری. -- کێشەکە هەر تەنها ئەوە نییە کە خراپەیەک دەکەیت. بەڵکوو خراپەکە چووەتەوە و دەچێتەوە ناو ڕێزبەندییەکی خراپەکارانەی دەیکە. کە ئەمانیش دەست دەکەنەوە بە ناردنی خراپە لە پانتاییەکی جووڵەکییەوە لەبۆ پانتاییەکی جووڵەکی دیکە.

§ ١ :

باشــــه ئــــەم دۆخــــە چــۆن ڕوویـــدا؟ ... لـــە ڕاســـتیدا ئەلگۆڕیتمـــەکانی ســـەرهێڵی دەســـتێکی باڵایـــان هەیـــە لـــە ســەپاندنی ئـەم ڕووکـارە. چونکـە ئـەوان نـەک هـەر تـەنها دەستپێشـــخەرن لـــە ئەنجامـــدانی خراپەیـــەک و نـــاردنی بڕووســـکەیەک، بـــەڵکوو ئـــەوان بەشـــداریش دەکـــەن لـــە بارگـــاویکردنی خـــودی پەیڕەوەکـــە و، لـــە دواجـــاردا بارگاویکردنی خودی بنکەدراوەکانیش.

§ ٢ :

شـــێتانەیە چەنـــدین تـــاک دەتـــوانن بیـــانوو لـــەبۆ کـــارە خراپـــەکانیان بهێننـــەوە. لـــەوەش ســـەیرتر ئەوەیـــە لـــێرەدا پـــەیڕەوێکی خودکـــاری خراپـــەکانیان پۆلێنبەنـــد دەکـــات و پاشـانیش دەیانخاتـە نـاو چوارچێوەیـەکی ئابوورییـەوە. — لازای فەییڕ!

§ ٣ :

هەندێک جیاوازی لە پێش سەدەی بیست و یەکدا، پانتایی کۆمەڵایەتی و کەلتوورییان پڕ دەکردەوە. بەڵام سەبارەت بە بەرزڕاگرتنی پەتاکان؟ ... ئەوە پرسێک نەبوو. ئێستا؟ ... ئێستایەک؟ ... ئەگەرچی پیشەکان دوا دەخرێنەوە لەبۆ کۆتا خاڵی بەرهەم-هێنانی خۆیان؛ ئەوا دووبارە پیشەکان دەگوازرێنەوە ... کێ مەزندەی دەکرد دۆخەکان گۆڕانکارییان بەسەردا بێت؟ ...

§ ٤ :

باڵۆنێکی زەبەلاحی خواست/ئارەزووی سەرکوتکراو لەناو تۆڕەکانی سەرهێڵ تەقایەوە. -- ئەم شەپۆل-شۆکە ئەوەندە وزەی نائاگایی ئازاد کرد ... کە بووە مایەی گاڵتەجاڕی. گاڵتەجاڕی ئەقڵی مرۆڤ ...

§ ٤.٥ :

وەک زۆربەی ڕۆشنبیران و بیرمەندان تا ئێستا دەزانن، "ماڵپەڕ" سوود لە یەکێک لە ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ

وەردەگـرێت و دەیکـات بـە قـەڵغانی ئـارەزووی خـۆی. --
سووڕەکانی ئارەزوو بەبێ ئۆرگانەکانی جەستە ڕوو نادەن.
-- دواجار ئەم پرسەش دەمانباتەوە سەر ئەو گەنگەشەیەی
لــە میانــەی <تەکنــەلۆژیا> و <چــاکبوون و خراپبــوونی
تەکنەلۆژیا>دا بەرجەستە بووە.



§ ٥ :

تاکێک پێویستی بە وزەبەخشی [Stimulants] سـاختە هەیـە
بۆ ئەوەی بەردەوام بێت لەم واقیعە دەستکردەدا.

§ ٦ :

چاکە — بوونێکی پاک و پیرۆزی هەیە و پێویستە بپارێزرێت. بەڵام ڕەهێڵەکانی خراپە بە بەردەوامی لە هەوڵی داگیرکردنی ئەم پاکەدایە. -- لێرەدا، ئەوە ئەرکی ئێمەیە وەکوو مرۆڤێک، وەکوو تاکێک، هەوڵی پاراستنی بوونێکی پاک و بوونێکی ناسک و چاک بدەین.



گووگڵ دەتوانێت ١٠٠ هەزار وەڵامت بۆ بگەڕێنێتەوە. بەڵام کتێب-زانێک دەتوانێت ئەوی گونجاوە بۆت بێنێتەوە.

— نیل گایمان

## بەشی سێیەم : ڕەخنە لە تاودانگەرایی نیک لاند



### تاودانگەرایی چییە؟

[Accelerationism] — تاودانگەرایی، بیرۆکەیەکی سیاسی و فەلسەفییە کە پێشنیاری ئەوە دەکات مرۆڤ بۆ ئەوەی گۆڕانکاریی ڕیشەیی دروست بکات سەرەتا دەبێت سیستەمی کۆمەڵایەتی و ئابووری و تەکنەلۆژی ئێستا خێراتر بکات بەرەو خاڵی شکاندنی خۆیان. هاتەوەکوو ڕێگە بە دارمانی سیستەمی کۆن یان گۆڕانکاری بۆ سیستەمێکی نوێ بدات.

مـــێژووی ئــەم چەمکــە دەگەڕێتــەوە بــۆ هــەردوو فەیلەسووفی فەڕەنسـی: ١. ژیل دۆڵۆز ٢. فیلێکس گواتـاری. لە پەڕتووکی [دژە-ئۆدیب]دا.

پێویســتە خراپــەکان بــەرەو ســنوور پـاڵ بـنێن، خراپتریـان بکـــەن، بیانگەیەننـــە دۆخی پارۆکســـیزم بـــۆ ئـــەوەی گۆڕانکارییـەک بهێنێتـە ئـاراوە. (Deleuze and Guattari, 1972, p. 253)



لە ساڵانی نەوەدەکاندا، فەیلەسوفی بەریتانی نیک لاند زیـاتر چـەمکی "تاودانگـەرایی/خێراگـەرایی"ی پەرەپێـدا و ئامـاژەی

بەوەدا کە خێراکردنی پێشکەوتنی تەکنەلۆژی و سەرمایەداری لە کۆتاییدا دەبێتە هۆی دروستکردنی خاڵێکی تاکگەرایی [Singularity] و پچڕانێکی ڕیشەیی لەگەڵ ڕابردوودا کە دەبێتە هۆی دروستکردنی جیهانێکی نوێ لە دوای جیهانی مرۆڤایەتی ... — لاند بە شێوەیەکی بەرفراوان لەسەر خێراگەرایی نووسیوە، لە وتارەکەیدا " Meltdown" (1995) و کتێبەکەی "Fanged Noumena" (2011).



(وێنەی نیک لاند — Nick Land)

— لەم ساڵانەی دواییدا خێراگەرایی لەلایەن بزووتنەوە سیاسییە جیاوازەکانەوە وەرگیراوە و بەکار هاتووە ... لەوانەش گرووپی ڕاستڕەوی ئاڵت و گرووپی چەپ، ئینتەرناشناڵی خێراخوازی. بەڵام ئەم چەمکە هێشتا جێی مشتومڕە و ڕەخنەی زۆری لێ گیراوە کە توانای پاساودانی کردەوەی توندوتیژی و تێکدەرانە لە پێناو گۆڕانکاری ڕیشەیی.

**خودی ڕەخنەکە:**

هەرچەندە دەزانم خودی چەمکەکە ڕۆ چووەتە ناو گەلێک بواری دیکە ... بەڵام بە گشتی من باوەڕ ناکەم خراپە بە خراپە چارەسەر بکرێت. تاودانگەرایی هەوڵ دەدات دۆخە خراپەکان بخاتە ئەوپەڕی خراپییان، هەتاوەکوو دابڕمێن و نەمێنن. ئەم جۆرە لابردنی خراپەیە بە تێڕوانینی خۆم تشتێکی پێویست نییە بۆ جیهانی مۆدێرنیتەی ئێستامان. وە ئازار هەمیشە ناخۆشترە و ناڕەحەتترە لە خۆشی. باشتر

وایە بە چاوەڕوانییەوە لـە دوای کێشـەکان بین نـەوەکوو بـە پەلەپەلی کاتی هەوڵی خراپترکردنیان بدەین.



خوابکا هەموو ڕۆژێکی ژیانت بژیت.

— جۆناسان سویفت

# بەشی چوارەم: شت و شتەکان

[٠] چی هەیە؟

[٠.١] شتێک هەیە، ئەگەرچی وەهمیش بێت

[١] بەراوردکارییەک لەنێوان شت و شتەکان

[٢] ئایە شتێک دەتوانێت لەخۆی بکۆڵێتەوە؟

٢.٢) لە پارچەکانەوە لەبۆ گشتییەکان

٢.٣) ئایە شتەکان دەتوانن لە خۆیان بکۆڵنەوە

٢.٤) ئایە شتەکانی ناو شتەکە دەتوانن لە شتەکە بکۆڵنەوە

٣) ڕەخنەیەک لەبەرانبەر <هەبوونی توانای لێکۆڵینەوەی شتەکە لەناو خۆیدا>

٤) زنجیرە بێکۆتاییەکە[ان]

# شت و شتەکان

٢١ی ٢ی ٢٠٢٠ نوسـراوەتەوە. — لـەم پەڕتووکـەدا بـە تەواوەتی نوێ کراوەتەوە و لە پلەی باڵای خۆیدایە.



[٠] چی هەیە؟ ...

سـەرەتا شـتێک هەیـە ... ئـەم شـتە چییـە؟ ... جـارێ بـا لـە پۆلێنکردنی گەڕێین ... بەڵام گرینگ ئەوەیە؛ شتێک هەیە.

[٠.١] شتێک هەیە، ئەگەرچی وەهمیش بێت.

لەڕاستیدا، شتێک هەیە لە جیاتی ئەوەی شتێک نەبێت. ئەم دەستەواژەیە لە سێ بنەمای سەرەکی پێک هاتووە:

١. شتێک هەیە لەجیاتی نەبوونی شتێک. (یاسای بوون).

٢. شتێک هەیە ئەگەرچی وەهمیش بێت. (وەهم نابوون نییە).

٣. وەهمی شتێک، واتای نەبوونی شتێک نییە.

ئەمە بەڵگەیەکی سادەیە بۆ هەبوونی شتێک.

[١] بەراوردکارییەک لەنێوان شت و شتەکان

شت وەکوو یەکەیەکی سەربەخۆ، کە لەناو پەیوەندیدایە لەنێوان شتەکانی تردا(ئەو شتانەی کە خۆی نین، [ئەو شتانەی کە خۆی نین بەشێکن لە [سیستەمی] خۆی، چونکە بە هۆی هەبوونی خۆی، ئینجا دەتوانێت ئەو شتانەی کە خۆی نین، جیاکاری کردن بکات لەنێوانیاندا])

شتەکان پێک هاتوون لە شت و شتیش بە تەنها دەتواندرێت پێک هاتبێت لە کۆمەڵێک شت کە شتەکان درووست دەکەن

[١] شت لەنێو خۆیدا، یەکەیەکی سەربەخیەۆ. بەڵام لە پەیوەندیدا لەگەڵ شتەکانی دیکەدا تایبەتمەندییەکی نێو-سەربەخۆیی هەیە. (interdependent)

شتەکان بەیەکەوە دەلکێن و شتەکانی دیکە درووست دەکەن.

***

[٢] ئایە شتێک دەتوانێت لەخۆی بکۆڵێتەوە؟ ...

{شتەکە لە لێکۆڵینەوە لەناوەوەی خۆیدا - تێکچوونی شتەکە بە هۆی هەوڵدان لە لێکۆڵینەوە لەناوەوەی خۆیدا}

لێرەدا مەبەست لە <هەبوونی توانای لێکۆڵینەوەی شتەکە لەناوەوەی خۆیدا> گەڕانەوەیەک نییە [لە]بۆ سەر بابەتی

<شتەکە لەناوەوەی خۆیدا>، بەڵکوو مەبەست لەوەیە کە شتەکە، خۆی لە ناوەوەی خۆی دەکۆڵێتەوە و جیاکاری دەکات لەنێوان خۆی و ئەوان.

شتێک بە هۆی [هە]بوونی لەناو پەیوەندییەکدا(هەمئاهەنگییەکی ناچارەکی[، مەبەست لەوەیە کە بەبێ ویستی خۆی لەناو سیستەمەکەدا پەیدا بووە]) لەگەڵ شتەکانی تردا، دەتوانێت خودئاگاییی خۆی [بـ]بێت(چونکە بە هۆی ناسینی شتەکانی تر، [ئینجا خۆی دەناسێت،]دەزانێت کە خۆی خۆیەتی، چونکە شتەکانی تر خۆی نین، لێرەدا بیرۆکەی <خۆ> هەیە چونکە <ئەوان> هەیە و دیالێکتیکی <خۆ> و <ئەوان> [پەیدا] دەبێت). شتەکە بە هۆی هەبوونی ئەو توانایەی کە دەتوانێت بەگوێرەی بوونی خۆی لەناو پەیوەندییەکاندا و بە هۆی <ئەوان> دەزانێت کە <خۆ> کێیە و بەردەوام دەبێت لەناو ئەو سیستەمەی کە بە <خۆ> دەناسرێت (ئەگەر <خۆ>

بەتەنها بوونی هەبێت، ئەوە <خۆ> ناتوانێت خودئاگایی هەبێت، چونکە دەبێت بە بەشێک لە کۆی سیستەمی <خۆ> و چواردەوری <خۆ>). هەر چەند <خۆ> ئەوان بناسێت، ئەوە  ئەوەندەش <خۆ> خۆی دەناسێت.

کامێرایەک دەتوانێت دەوروبەری خۆی ڕیکۆرد بکات و زانیاری [بە هۆی وەرگرتنی لە دەرەوەدا بە هۆی هەبوونی توانای(إمكانيات) ناوەوەی] وەربگرێت. بەڵام هەمان کامێرا ناتوانێت ناوەوەی خۆی(پارچەکانی ناوەوەی، ئەو شتانەی کە کامێرایەکەی لێ درووست کردراوە، بەرد، شووشە، . . .تەنانەت گەردیلەکانیش) ڕیکۆرد بکات. وە هەر کاتێکیش کامێراکە هەر هەوڵێک بدات لە خۆکۆڵینەوە(لێکۆڵینەوە لە خۆی، خۆناسین)، ئەوە کامێراکە تێک دەچێت(لێکۆڵینەوە، بریتییە لە پارچەپارچە کردن) و لە کاری(وظيفة) خۆی دەکەوێت(چونکە کامێراکە ناتوانێت ئەو

شتانە ڕێکۆرد بکات کە خۆی لێی درووست بووە/پێک هاتووە).

❊❊❊

٢.٢) لە پارچەکانەوە لەبۆ گشتییەکان

{پێک هاتنی گشتییەکان بە هۆی پارچەکان - پارچە[کان] وەکوو بوونەوەرێکی گشتی - سەربەخۆبوون - هەمئاهەنگی - شتان و شت}

گشتی پێک هاتووە لە پارچەکان، وە بە پێچەوانەشەوە. کامێراکە پێک هاتووە لە پارچەکان، پارچەکانیش هەر یەکەکیان جۆرە شتێکە(بەرد، شووشە، پلاستیک . . .)، ئەم پارچانە بەیەکەوە هەمئاهەنگییەک درووست دەکەن کە کامێرایەکەیە. کامێراکە شتە گشتییەکەیە کە پێک هاتووە لە شتە پارچەیییەکان(کە شتە پارچەیییەکانیش خۆشیان بریتیین لە شتی گشتی...).

***

### ٢.٣) ئایە شتەکان دەتوانن لە خۆیان بکۆڵنەوە

{هەبوونی توانای لێکۆڵینەوە(بە هۆی هەبوونی دوو شت) لەنێوان دوو شتدا – هاوسیستەم بوونی دوو شت – دەرئەنجامی بێ بەڵگە(نەک بەڵگەنەویست)}

دوو شت کە هاوپەیوەندییان هەیە بە هۆی بوونیان لەناو یەک سیستەمدا(هاوسیستەم بوونی دوو شت)، شتی یەکەم و شتی دووەم(مەبەست لە چەمکی <یەکەم> و <دووەم> تەنها ژمارەییە)، بە هۆی ئەوەی کە لەلای شتی یەکەم شتی دووەم <ئەوان>ـە[(وە لەلای شتی دووەم، شتی یەکەم <ئەوان>ـە)]، ئەوە شتی یەکەم دەتوانێت بە هۆی هەبوونی شتی دووەم، پێگەی خۆی لەناو سیستەمەکەدا دەستنیشان بکات. شتی یەکەم بەتەنها ناتوانێت پێگەی خۆی دەستنیشان بکات لە کاتێکدا کە تەنها شتی یەکەم بوونی

هەیە، چونکە بەتەنهابوونی شتی یەکەم، شتی یەکەم خۆی پێگەی خۆی دەبێت، کە بریتییە لە یەک پێگە، کە پێگەی <شتی یەکەم>ـە. ئەگەر دوو کامێرا هەبن، ئەوە کامێرای یەکەم دەتوانێت ناوەوەی کامێرای دووەم ڕیکۆرد بکات و بە هۆی زانیاری وەرگرتن لە لێکۆڵینەوە لە کامێرای دووەم، کامێرای یەکەم دەتوانێت خۆی [پێگەی خۆی] بناسێت. واتا تەنها بە هەبوونی دوو شت، دەتواندرێت شتەکە بخسترێتە سەر لێکۆڵینەوە. بەڵام هەر ناتواندرێت [شتەکە] لە خودی خۆی بکۆڵدرێتەوە و بزاندرێت کە لە چی درووست بووە/پێکهاتووە، چونکە تەنها بە هۆی لێکۆڵینەوەی لە کامێرای دووەم(کە هەمان کامێران، هاوشێوەن)، دەتوانێت زانیاری دەستەبەر بکات لەسەر ئەوەی کە ئاخۆ پێکهاتەکەی(ستراکتۆر/سیستەم) خۆی چۆنە، کە ئەمە نابێتە بەڵگەیەکی تەواو [لە]بۆ دڵنیابوون لەسەر لێکۆڵینەوەکە لە

شتەکە(کامێرای دووەم) لە لێکۆڵینەوە لەناو خۆیدا(کامێرای یەکەم).

***

٢.٤) ئایە شتەکانی ناو شتەکە دەتوانن لە شتەکە بکۆڵنەوە {شتەکان لەناو شتدا – مێتافۆڕ یان مەتەڵ – ئەستەمبوونی لێکۆڵینەوە}

کۆمەڵێک/هەندێک لە شتەکان لەناو شتەکەدا دەژین، بوونی شتەکان پەیوەستە بە هەبوونیان و مانەوەیان لەناو شتەکەدا، شتەکان ناتوانن بچنە دەرەوەی شتەکە [لە]بۆ لێکۆڵینەوەی شتەکە(چونکە بوونیان پەیوەستە بە هەبوونیان لەناو شتەکەدا)، وە ناشتوانن لەناوەوەی شتەکە لە شتەکە بکۆڵنەوە، چونکە خۆیان [کۆمەڵە] پارچەیەکن/بەشێکن لە شتەکە(شتەکان [خۆیان]، شتەکە پێکدەهێنن [پێچەوانەکەشی ڕاستە(true)])، بەو واتایەی کە خۆشیان بەشێکن/پارچەیەکن لە شتەکە، لەبەر ئەوە ناتوانن

لێکۆڵینــەوە بکــەن لــە شــتەکەدا، چونکــە ئەگــەر شــتەکان بەیەکەوە شتەکە درووست بکەن، ئـەوە شـتەکە نـاتوانێت لـە خـۆی بکۆڵێتـەوە(چونکـە دەبێتـە یـەک شـت بەگشـتی و ئـەو گشــتییە بــەبێ بــوونی پارچــەکانی تــر، بــوونی نــابێت، وە ناشـتوانێت لـە پارچـەکان بکۆڵێتـەوە چونکـە پارچـەکان ئـەم توانایەی توانینی-لێکۆڵینـەوە-لـە-خـود دەدەن بـە گشـتییەکە، وە هەر کاتێک گشتییەکە هـەوڵ بـدات [لـە]بـۆ لێکۆڵینـەوە لـە پارچەکان، ئەوە ئەو توانایـەی توانیـنی-لێکۆڵینـەوە-لـە-خـود لەدەست دەدات بە هۆی شکست هێنانی ئەو سیستەمەی کـە ئـەو توانایـە دەسـتەبەر دەکـات کـە بتوانـدرێت لێکۆڵینــەوە لەسەر لێکۆڵینەوە لەسەر خۆی بکات).

***

٣) ڕەخنەیـەک لەبەرانبـەر >هـەبوونی توانـای لێکۆڵینـەوەی شتەکە لەناو خۆیدا<

{دەرکەوتنی زنجیرەبێکۆتاییەکان - دەزانێت کە نازانێت کەواتا دەزانێت}

ئەگەر شتەکە نەتوانێت لە[ناوەوەی] خۆی بکۆڵێتەوە، ئەی چۆن دەتوانێت بزانێت کە ناتوانێت لەناوەوەی خۆی بکۆڵێتەوە. ئایە ئەمە [جۆرێک لە] هەبوونی توانای لێکۆڵینەوە لەناوەوەی شتەکەدا دەرناخات کە دەزانێت ناتوانێت لەناوەوەی خۆی بکۆڵێتەوە(ئەگەر شتەکە ئەو توانایەی هەبێت کە بزانێت کە ناتوانێت لەناوەوەی خۆی بکۆڵێتەوە، کەواتا شتەکە دەتوانێت لەناوەوەی خۆی بکۆڵێتەوە). لەبەر ئەوەی شتەکە دەزانێت کە ناتوانێت لەناوەوەی خۆی بکۆڵێتەوە، کەواتا دەتوانێت لەناوەوەی خۆی بکۆڵێتەوە. بەڵام ئە[د]ی چۆن بیرۆکەی ئەوەی لەلا درووست بوو کە ناتوانێت لەناوەوەی خۆی بکۆڵێتەوە، وە پاشان ئەو بیرۆکەیەی کە <دەزانێت کە نازانێت لەناوەوەی خۆی بکۆڵێتەوە کەواتە دەتوانێت لەناوەوەی خۆی

بکۆڵێتەوە>. لێرەدا شتەکان/بابەتەکان دەکەونە ناو گەمەیەکی بێکۆتاییانەی زنجیرەیی. کە نە دەتواندرێت لەناویدا بمێندرێتەوە، وە نە دەتواندرێت لەناویدا دەرباز ببێت و وێنە گشتییەکە(وێنە گشتییەکە بەو واتایەی کە لە دەرەوەی سیستەمەکەدا تەماشای سیستەمەکە دەکات) ببینێت. "هەرگیز نابێت و ناتواندرێت ئەم بابەتە بێتە تێگەیشتن، چونکە هەر کە تێگەیشتین، ئێمە تووشی تێکچوون دێین. لەبەرئەوەی خۆشمان سیستەمین، لەبەر ئەوەیە کە هەمیشە بە هەڵە تێیدەگەین[، هەتا تێکنەچین]؟"

***

٤) زنجیرە بێکۆتاییەکە[ان]

{پارادۆکسەکان - مێتا(meta) - مێتا-زنجیرەبێکۆتاییەکان - زنجیرەبێکۆتاییەکان - بێوەڵامیەتی یان پرسیارنەکردنی پرسیارە سەرەکییەکان - زمان}

(هۆکاری هەبوون و نەبوونی پاشگری <ان> برتییە لەوەی کە بە هۆی زیاتر بیرکردنەوە لە بابەتەکەدا، [لە]بۆمان دەردەکەوێت کە زنجیرەبێکۆتاییەکان [هەر] هەموویان دەگەڕێنەوە [لە]بۆ سەر یەک ڕەگ/ڕەگەز/بنچینە . . . کە ئەم ڕەگە بریتییە لە زنجیرەبێکۆتاییەکە، کە یەک زنجیرەبێکۆتایی گشتییە و هەموو زنجیرەبێکۆتاییەکان وەکوو لق وان [لە]بۆی/بەشێکن لەو)

زنجیرەبێکۆتاییەکان [جۆرێک لە] مێتا(meta–خۆخۆیی) نین. زنجیرەبێکۆتاییەکان بە پێچەوانەی مێتا، ئەو چوارگۆشە داخراوانەن کە شتەکان ناتوانن لەناویان دەربچن. کە تەنانەت بە مێتاش ناتوانن لێیان بکۆڵنەوە و دەربچن و سنوورێکە کە مێتا دەوەستێت و زنجیرەبێکۆتایی دەست پێ دەکات.

زنجیرەبێکۆتاییەکان بەرانبەر بە مێتایە، کە مێتا بریتییە لە:

<دروووست کردنی فیلمێک که باس له دروووست کردنی فیلمێک دەکات>

<تیانووسێک که نووسراوه تیانووسەکان چین>

<پرسیاری <فەلسەفە چییە> [چونکە ئەم پرسیارە خۆی بەشێکە لە فەلسەفە(پرسیارێکی فەلسەفییە)]>

دوای باسکردنی مێتا، [[له]بۆ بەراوردکردن لەنێوان هەر دوو چەمکەکەدا]هەندێک لە نموونەکانی زنجیرەبێکۆتاییەکانیش دەنووسین که بریتیین له(ئاگاداری: بە باسکردن و نموونە هێنانەوەی زنجیرەبێکۆتاییەکان، مانای ئەوە ناگەیەنێت کە لە دووری کاریگەری(effect) زنجیرەبێکۆتاییەکاندا، سەیری زنجیرەبێکۆتاییەکان دەکەین، بەڵکوو ئێمە لەناو زنجیرەبێکۆتاییەکەداین کاتێک که باسی زنجیرەبێکۆتاییەکان دەکەین):

<دروووست کردنی فیلمێک که لە کۆتاییەکەیدا، کامێراکان وردە وردە دەچنە پشتەوە و دیمەنی ستۆدیۆیەکە پێشانی

بینەران دەدەن، فیلمەکە دەیەوێت بڵێت کە ئەم فیلمەی ئێوە تەماشای دەکەن، لە ڕاستیدا ڕاستەقینە نییە و فیلمە، بەڵام زنجیرەبێکۆتاییەکە ئەوەیە کە تەنانەت ئەم فیلمەش، بە ستۆدیۆ درووست کردراوە و ئەگەر هەزارەها جار کامێراکە بێتە پشتی فیلمەکە و ستۆدیۆکەمان پێ پیشان بدات، ئەوە هەر ناتوانێت ئەو ستۆدیۆیە و کەلوپەلەکانی ئەو فیلمەمان پێ پیشان بدات کە تەماشای دەکەین(کە فیلمەکەی لێ درووست کردراوە)>.

<نەبوونی سیستەم، جۆرێکە/فۆرمێکە لە هەبوونی سیستەم. کەواتا نە بە هەبوونی جۆرە سیستەمێک دەتوانین لە سیستەمبوون دەربچین، نە بە نەبوونی سیستەم دەتوانین لە سیستەم نەبوون دەربچین، دواجار هەر دوو چەمکەکە ڕووی یەک دراون>.

<شتەکە ناتوانێت لەناوەوەی خۆی بکۆڵێتەوە بەڵام چونکە دەزانێت کە نازانێت لەناوەوەی خۆی بکۆڵێتەوە کەواتا دەتوانێت لەناوەوەی خۆی بکۆڵێتەوە . . .>.

<زنجیرەبێکۆتا لەناو زنجیرەبێکۆتا لەناو زنجیرەبێکۆتا. . .یان مێتا-زنجیرەبێکۆتاییەکان> <لێکۆڵینەوە لە زنجیرەبێکۆتاییەکان، شتەکە دەباتەوە سەر زنجیرەبێکۆتاییەکان>.

لە کاتێکدا زنجیرەبێکۆتاییەکان وەکوو مێتا نین(لەوانەیە <مێتا بەشێک بێت لە زنجیرەبێکۆتاییەکان> یاخود بە پێچەوانەوە؟)، بەڵکوو زنجیرەبێکۆتاییەکان ئەو چوارگۆشە داخراوانەن کە شتەکان ناتوانن لەناویان دەربچن و بە چوارگۆشەکە و دەرەوەی چوارگۆشەکەوە، تەنانەت پرسیاری <ئاخۆ دەتوانین لە دەرەوەی زنجیرەبێکۆتاییەکاندا، لێکۆڵینەوە بکەین> دەچێتە ناو

کاتیگۆری زنجیرەبێکۆتاییەکانەوە. وە هەر شتێک کە هەبێت زنجیرەبێکۆتاییەکی هەیە و بە هەر هەوڵدانێک [لە]بۆ دەرچوون و لێکۆڵینەوەی شتەکان لە زنجیرەبێکۆتاییەکەیاندا، شتەکان تووشی دارمان دێن لە بوونی خۆیان و چیتر لە تواناییاندا نابێت <خۆ>یان ببن، بەڵکوو دەبن بە شتێکی تر(هەر کە بوو بە شتێکی تر، ئەوە تووشی تێکچوونی دەبێت، چونکە <شتێکی تر> بریتی نییە لە خۆی، تەنها بە <خۆ>بوونی دەتوانێت <خۆ>ییەتی بکات، ئەگەرنا تێک دەچێت، وە تەنانەت هەبوونی توانای تێکچوونیش بەشێکە لە <خۆ>بوون، هەر کە شتەکە بزانێت کە خۆی بوونی هەیە، ئەوە تەنانەت تێکچوونیشی دەبێت بە بەشێک لە <خۆ>).

ئایە زنجیرەبێکۆتاییەکان، بریتیین لە بەشێک لە سرووشتی زمان(زمانی مرۆڤ) یاخود نا؟. . .

هــەرگیز مەهێڵــە هەســتی مــۆڕاڵیت ڕێگــریت لێ بکــات لــە ئەنجامدانی کارێکی ڕاست.

— ئیسحاق ئاسیمۆڤ، فاوندەیشن (Foundation)

# بەشی پێنجەم: سێ چەمکی نەخوێندەواری

# دەروازە



هەرسێک چەمکی: خوێندەوار، نەخوێندەوار، ڕۆشنبیر ... تەواوی سووچەکانی ناوەندە ئەکادیمی و "پەڕتووک"ـیەکانیان داگیر کردووە. بەڵام وا پێویست دەکات ئەم سێ چەمکە دووبارە خوێندنەوەیەکی ڕەخنەیی و تازەیان لەبۆ بکرێتەوە. چونکە ئەم سێ چەمکە هەر لەسەر هەمان ئاواز و هۆنراوەی نەستەقی خۆیان سووڕ دەدەنەوە. وە پێویست بوو ئەم سێ چەمکە ڕێگەیان لێ بگیرێت و دووبارە هەڵبسەنگێندرێنەوە لەلایەن خودی فەلسەفەوە.

بەتایبەتتر ئەم سێ چەمکە زۆرتر لەگەڵ پرسێکی دیکەدا بەکار دێن کە بە بابەتی ڕامیاری (سیاسەت) ناسراوە. وە هەمیشە هەوڵ دەدرێت ئەم سێ چەمکەی سەرەوە لەگەڵ بابەتە ڕامیارییەکاندا پێک بلکێندرێن.

لەم پارچە نووسینەدا هەوڵمان داوە خوێندنەوەیەکی ڕەخنەیی لە خزمەت تێگەیشتندا پێشکەش بەم سێ چەمکەی سەرەوە بکەین.

پەیکەربەندی توێژینەوەکەمان بەم شێوازەی خوارەوەیە:

لە خاڵی [٠]دا ئاماژەمان بە مانا باوەکەی چەمکی نووسەر و خوێندەوار کردووە. لە [٠.١] ئاماژەمان بە چەمکی نەخوێندەوار داوە. لە خاڵی [١] باسمان لە ستوون و پانتاییەکانی هونەر کردووە. لە [٢] پرسیارە ڕیشەییە هونەرییەکانمان سەبارەت بەم پرسە شی کردووەتەوە. وە لە خاڵی [٣] چەمکی کردەی ڕامیاریمان ورووژاندووە. لە

خـاڵی [٤] و کۆتاییـدا، پرسـی بەئاگاهاتنـەوەی هاوکێشـە-سیمبولییەکانمان شی کردووەتەوە.



## [۰] {<نووسەر-و-خوێندەوار> کێیە؟}

چـــەمکی "نووســـەر-و-خوێنـــدەوار"، ســـەرتاپاگیرییەکی بیڕیشەییە بەسەر کۆمەڵێک ئارکیتایپ(Archetype)/مۆدێل و تاکدا. کە بەشدارن [بەڕاستەوخۆیی-و-ناڕاستەوخۆیی] لەسەر دەربڕینی ویستی خودی <دەرکەوتە>کەیان. "بە گشتی" ئەم لق-و-پۆپانەی خوارەوە دەگرێتەوە [بەتایبەتی لە ئێستادا، سەدەی بیست و یەک] :-

١) هونەرمەند

٢) نووسەر

٣) خوێندەوار (خوێندکاری تێکست: پەڕتووک،گوتار ...)

ئەم کۆتاکانە، هەمیشە بە جۆرێک لە جۆرەکان بەرهەڵستی و "ڕەخنەیان" لە <کردەی ڕامیاری> و <هێزی-ستوونی سەروو> خۆیان گرتووە. [بەڵام] لەناو پانتایی ڕاستییەکاندا، ئەوان [خودی خۆیان بە تاک] نەیان توانیوە ئەم "ڕەخنانە"

جێبەجێ بکەن بەسەر خۆیاندا. ئەوجا چیجای ئەوەی بەسەر کۆتاکێک بیسەپێنن ...

لە پەتیترین پێناسەدا :- چەمکی <نووسەر> بریتییە لەو <تاک-و-ئارکیتایپ>ەی کە [تەنها-و-تەنها] بەشدارە لە کۆمەڵێک وردەپڕۆسێسی وەکوو:-

{<نووسین>/"<قەڵەم>"/<تێڕامان> ... }

وە لە پەتیترین پێناسەدا، <هونەرمەند> بریتییە لە کۆمەڵێک وردەپڕۆسێسی وەکوو :-

{<هونەر>/<ئێستاتیکAesthetics>/"<جوانی>"/"<ناشیرنی>"/<دەرخستنی ئازار-و-ژانە نێوخۆییەکان بە "ناڕاستەوخۆیی"> ... }

چەمکی <خوێندەوار> لە پەتیترین پێناسەدا، هاوپەیوەندە بە کۆمەڵێک وردەپڕۆسێسێکی وەکوو :-

{<نووسین(بە هەموو جۆرەکانی)>/<پەڕتووک>/<هونەرویستی ناڕاستەوخۆ> ... }

لێرەدا دەبینین کەوا [بە پێی ئەو پێناسانەی خستمانە ڕوو]، ئەم جۆرە <ئاڕکیتایپ-و-تاک>انە، ئەگەریەتی نەبوون بە <بەرپرسیار>یان دەردەخات. [بەڵام] بە دڵنیاییەوە خۆ ئەوان دەتوانن <بەرپرسیار> ببن لە ئاست-و-پێگەی خۆیاندا ...

لێرەدا دەگەین بەم ئەنجامەی بە پێی <بەڵگەنەویستییەت بە ئەنجامی ئەزموونکردن>ەوە وەرمان گرتووە کەوا:-

١) ئەگەریەتی ئەستەمبوون:-

<نووسەر-و-خوێندەوار> :- <مێتاگەرایی>/<مێتا-کۆنتێکست> – <تاکگەرایی> – <خۆویستگەرایی> – <ڕێبازی-ڕۆمانسییەتی-ناڕاستەوخۆ> – <ڕێبازی-

تاقیگەری-ناڕاستەوخۆ> – <ئەستەمیەتی بڕیاردانی-یەکلاکاری/یەکلاکەرەوە>...

٢) ئەگەریەتی ئەستەمنەبوون:-

<بەرپرسیارگەرا> :- <تاکباوەڕی>/<چەقبەستوویی-هیزری> -- <کۆتاکگەرایی> -- <ئەوانیترگەرایی> -- <ڕێبازی-توندییەتی-ڕاستەوخۆ>/<بانهەیوانکار> -- <ڕێکوپێکگەرایی> -- <توانستی بڕیاردانی یەکلاکاری/یەکلاکەرەوە>...



**[٠.١] {<نەخوێندەوار> کێیە؟}**

[لەدوای ئەوەی هەوڵمان دا پێناسەیەکی چڕ لەبۆ چەمکی <خوێندەوار-و-نووسەر> بکەین، لێرەدا هەوڵ دەدەین تیشک بخەینەوە سەر چەمکی <نەخوێندەوار>. ئایە <نەخوێندەوار> کێیە؟ تەنانەت:- <نەخوێندەوار> چییە؟... چونکە هەمیشە لەگەڵ چەمکگەلێکی وەکوو <خوێندەواردا/نووسەردا>، چەمکی <نەخوێندەوار> هاتووە.]

لێرەدا پرسیارێکی ڕیشەیی بوونی هەیە:- ئایە <نەخوێندەوار>ی ڕاستەقینە کێیە؟ چی جۆرێک لە مۆدێل-و-تاک، سەر بەم "پانتاییە-مۆریی"یەن؟ ... چەمکی <نەخوێندەوار> بە پێناسەکردنێک کە [ئەگەر] لەلایەن "<خوێندەوار-و-نووسەر>"ـەکانەوە دەرببڕدرێت، بریتییە لە "نەزان" و "نائاگا". بەڵام لە ڕاستیدا، تاک-و-مۆدێلی <نەخوێندەوار> پێویستییەکی گرینگی ژیانی

کۆتاکەکانە. نەوەکوو هەر پێویستییەک. بەڵکوو لە ڕاستیدا، <نەخوێندەوار> سەرخێڵ و ڕابەرە و، لە ڕووی <هێزی-ستوونی>ەوە زاڵە بەسەر <خوێندەوار-و-نووسەر>ەکاندا.

ئەگەر ئێمە دووبارە هەوڵێک بدەینەوە لە پای پێناسەکردنەوەی چەمکی <نەخوێندەوار>، ئەوا دەبینین کەوا تاک-و-مۆدێلی <نەخوێندەوار> (هەڵبەت نەخوێندەوارێکی درۆلەگەڵخۆنەکار) بریتییە لە کۆتاکێک لەنێو/لەنێوان <وردەپڕۆسێسی ڕاستەوخۆوناڕاستەوخۆ> کەوا ئەگەر گەیشتن بە دۆخێک لەبۆ ئامادەبوونی <دەرپەڕاندنی وزەیی>، ئەوا دەکرێت و، ئەگەریەتی درەوشانەوەی تێدا هەیە/دەبێت. ئەگەر ئێمە پێناسەیەکی ڕیشەدار و چڕ بکەین لەبۆ چەمکی <نەخوێندەوار> و بەدوور لە <کاریگەری ڕاستەوخۆوناڕاستەوخۆ>ی

"<خوێندەوار-و-نووسەران>، ئەوا "دەکرێت" بەم شێوازەی خوارەوە بە ئەنجام بگەیەندرێت :-

چەمکی <نەخوێندەوار> خۆی لە کۆمەڵێک <وردە-پرۆسێسی ڕاستەوخۆوناڕاستەوخۆ>ییدا دەبینێت، کە لە چڕترین پێناسەدا، دەکرێن بەم خاڵ-و-ئاماژانەی خوارەوە -:

١) <نەخوێندەوار> پەیوەستە بە بنەما-و-هەڵوێستگەلێکی <سایکۆ-بایۆلۆژی> وەکوو:-

وادابنێ <نەخوێندەوار> ئەو کەسانەن کەوا [بەو پێناسەی کە لەسەرەوە کردمان] لێکدژی <خوێندەوار>ن. <دەستەواژەیەکی-بەڵگەنەویست>ە ئەگەر ئێمە بڵێین کەوا <خوێندەوار> و <نەخوێندەوار> دوو جەمسەرن. <خوێندەوار> لەلایەک و <نەخوێندەوار> لەلایەکی تر.

ئێمەی کۆتاک/تاک، هەموومان باوەڕمان بەم پانتاییە هەیە لە ئاستی نەستی خۆمان.

<نەخوێندەوار> [بە پێی پێناسەی پەتی/پاک،] پابەندێکی-ناچارەکییە سەبارەت بە چەند بەهاگەلێکی وەکوو :- <ئامانجدار> - <تاکباوەڕی> - <ئاستی ستوونی مرۆڤەکان(هایەڕئاڕکی)> -- <کۆتاکەکان لە خزم-و-کەسوکار و-هاوڕێ پێک هاتوون <...>. ئەستەمە [بە پێی ئەو پێناسەی کە کردمان لەبۆ <خوێندەوار>] <خوێندەوار> باوەڕ و هۆشمەندی بە تەنانەت نیوەی ئەم بەهایانە بهێنێت. چونکە لەلای <خوێندەوار> هەموو ئەم بەهایانە "ڕێژەیین" و <ئەگەریەتی-دەستکاریکردن>یان تێدا هەیە.

بەڵام هەموو ئەم بەهایانەی کەوا <نەخوێدەوار> باوەڕی پێیەتی، دەشێن لەبۆ ئەنجامدان و بەرهەڵستیکردن هەر

<کردەیەکی ڕامیاری>. بەڵام هیچ بەهایەکی مرۆڤی <خوێندەوار> ناتوانێت هاوپەیوەند/پابەندی-ناچارەکی ببێت سەبارەت بە هەر <کردەیەکی ڕامیاری>.

کاتێک کە <کردەیەکی ڕامیاری> ئەگەریەتی لەناوبردنی ڕێژەیەکی زۆری تاکەکانی هەیە، بەڵام لە هەمان باردا؛ ئەگەریەتی پاراستنی ڕێژەیەکی کەمی تاکەکانی هەیە، ئەوا لەم چرکەساتەهەستیارەدا، مرۆڤی <خوێندەوار> هەرگیز ناتوانێت تاکێک لەناو ببات چیجای لەناوبردنی ڕێژەیەکی زۆری تاکەکان لەبەر <کردەیەکی ڕامیاری>. یان ئەوەتا مرۆڤی <خوێندەوار> درۆ لەگەڵ خۆیدا دەکات و، <خوێندەوار> نییە، یان ئەوەتا هەر <خوێندەوار> نەبووە و تەنها بە ڕووکەش/فێڵ، بەسەر ڕەوتەکەدا سەرکەوتووە.

## [١] {لەنێوان ستوون و پانتایی هونەریدا}:

زۆرێک لە "خوێنەر-و-نووسەر" بەبەردەوامی ڕەخنە لە دەسەڵاتی سەرەوەی خۆییان دەگرن و دەڵێن کەوایە <دەسەڵاتی سەرەوەی-خۆیان> هەموو نەخوێندەوار و نەزان و گەمژەن. بەڵام لێرەدا پرسیارێکی ڕیشەیی خۆی شاردووەتەوە :- ئایە <نووسەر/خوێندەوار> دەکرێت یاخود توانستی بوون بە سەرکردە/ڕابەر/دەوڵەتدار/بەرپرسیارگەراییەتیان تێدا هەیە؟ "ڕەخنەی" "<خوێنەر-و-نووسەر>" چییە لە سەروو خۆیان؟:-

ڕەخنەگەلێکی لەم شێوانەی خوارەوە:-

١) <سەرەوەکانی من، چێژگەران>.

٢) <سەرەوەکانی من، سوودگەران>.

٣) <سەرەوەکانی من، گەندەڵن>.

با دانەبەدانەی ئەم ئارگیۆمێنتانە شی بکەینەوە و بزانین مەبەستی ناوەکی چییە:-

١) دەستەواژەی <سەرەوەکانی من، چێژگەران>:-

ئایە بە چلۆن پاساوێک "ڕەخنەگر" کە خۆی هەمان <گەرا>ی هەیە، دەتوانێت "ڕەخنە"ی <گەرا> بگرێت؟ وا دابنێ ئەم ڕەخنەیەی کە "ڕەخنەگر" گرتوویەتی، پرسیارێکی پڕبەپێستی <دۆخی-ئێستا>یە. بەڵام لە هەمان کاتدا، ئایە چلۆن خودی "ڕەخنەگر" ئەگەریەتی ڕەخنەلێگرتنی نییە؟ ئەگەر بەم شێوەیە بێت. دەستەواژەکان تەنها لەلایەن <ڕەخنەگر> دەردەچن و لەبۆ <ڕەخنەلێگیراو> ڕادەوەستێن و هیچ هاوپەیوەندییەک و ئاڵوگۆڕییەک بوونی نییە. کاتێک "هونەرمەند"ێک دەڵێت:- ئەوان چێژگەران. باشە لەبەر چلۆن هۆکارێک، < <جگەرەکێشان>/<خواردنەوەی شەڕاب-و-مەی>/<چێژ> > سەر بە <ڕەوەندی چێژگەرایی> نییە؟ بەڵکوو چەمکی <هونەرمەند> لێوانلێوە

له <چێژی بینین:- ڕەنگەکان> <چێژی بیستن:- میووزیکا>. ئایه مەگەر ئەمانه به چێژ دانادرێن لەلای "هونەرمەند"؟ وادیاره خواردنەوەی مەی، <کردەیەکی چێژگەرا>یانه نییه؟ "نا نا! خواردنەوەی مەی تەنها لەبەر خاتری چاوه جوانەکانی هونەره! بۆ ئەوەیه که فیکرەی هونەریمان بۆ بێت!".



## [٢] {پرسیارە ڕیشەییە هونەرییەکان} :

لێرەدا پرسیارە ڕیشەییەکە ئەمەیە:- ئایە دەکرێت "کەسێک" کەوا سەر بە ڕێبازێکی <ڕاستەوخۆ یاخود ناڕاستەوخۆ>ی ئەدەب/هونەر گەلێکی وەکوو <ڕێبازی ڕۆمانسییەت> و <ڕێبازی تاقیگەری> بێت، ببێت بە سەرکردە/ڕابەر/بەڕێوەبەر؟ ... ئایە ئەم توانستەی تێدا هەیە؟ ... وا دابنێ ئەوانەی کەوا سەر بە <ڕێبازی ڕۆمانسییەت>ن، بریتین لە "هەڵبەستزانەکان"/"وێنەکێشان"/"میووزیکژەنەکان" ... یاخود هەر کەسێک کەوا "ویستە شاراوەکانی لە ڕێگەی هونەرەوە دەردەبڕێت" – چونکە ئەمە کاری هونەرمەندە –. وە هەروەها ئەوانەی خۆیان بە <ڕێبازی تاقیگەری> دادەنێن. وادابنێ کەوا کۆتاکێکی وەکوو :- دادایستییەکان (Dadaist) – ئاڤانت-گاردەکان (Avantgarde)....ن.

<ڕێبازی تاقیگەری>، لە بەرامبەر <ڕێکوپێکگەرایی> و

<ئاساییبوون>دا ڕێک خستراوە. چلۆن ڕێبازێکی هونەری-و-ئەدەبی (هونەر بە گشتی) کەوا لە دژی <ڕێکخراوبوون> دەرکەوتووە، دەتوانێت <ڕێکخراوبوون> بەڕێوە ببات و کاری لەسەر بکات؟ ... ئەسڵەن <ڕێبازی ڕۆمانسییەت> لێکدژە لەگەڵ <ڕێبازی تاقیگەری>، بەڵام هەردووکیان لێکدژن لەگەڵ <کردەی ڕامیاری> و <بەرپرسیارگەرایی>. ئەم لێکدژییەش بە هۆکاری بنچینەیەکی زۆر سادەیە. ئەویش ئەوەیە کەوا هەردووک لەم ڕێبازە، سەر بە بابەتێکن/لەنێو سێتێکن کە پێی دەگوترێت :- هونەر.

هونەر = نا<کردەی ڕامیاری>.

<کردەی ڕامیاری> = نا<هونەر.

{هونەر} سێتێکە پڕاوپڕە لە کۆمەڵێک بەهای تایبەت بە خودی سێتەکە.

{<کردەی ڕامیاری>} سێتێکە هیچ کەرستەیەکی سێتی {هونەر}ی تێدا نییە.

<هونەر> وەکوو قەوارەیەکی گشتی. چەمکێکی کورتکراوە لەبۆ دەستەواژە درێژکراوەکان. هەر ئەسڵەن هەندێک کات <هونەر> وەکوو کردەیەکی دژی <کردەی ڕامیاری> بەکار هێندراوە و خەملێندراوە.



## [٣] {کردەی ڕامیاری} :

له پانتایی <کردەی ڕامیاری>دا، تەنها <کردەی ڕامیاری> خۆگونجێنەر دەبێت لەگەڵ خودی پڕۆسێسی <کردەی ڕامیاری>دا.

لەبۆوێنە:- <پڕۆسێسی ڕامیاری> بەندە بەسەر چەند پڕۆسێسێکی وردتری وەکوو :-

١) پڕۆسێسی بەرژەوەندییەکان.

٢) پڕۆسێسی گڵدانەوەی سوود.

٣) پڕۆسێسی ئاڵوگۆڕکردنی وزەی هێزە کۆمەڵایەتییەکان.

٤) پڕۆسێسی کۆنترۆڵکردنی وزەی هێزە کۆمەڵایەتییەکان.

[وادابنێ کەوا] ئەم جۆرە "وردە"-پڕۆسێسانە بەشدارن لە تاودانکردن و کەڵەکەکردنی "درشتە"-پڕۆسێسی <کردەی ڕامیاری> بە گشتی. <کردەی ڕامیاری> لە کۆتاییدا وەکوو <قەوارەیەک> خۆی دەبینێتەوە. وەکوو ئێسکەپەیکەرێک کە

گۆشتەکەی بریتییە لە ویستێک کەوا بەدەرە لە <ڕێبازی ڕۆمانسییەت> و <ڕێبازی تاقیگەری>.



**[٤] {بەئاگاهاتنەوەی هاوکێشە-سیمبولییەکان} :**

ئـــەدی ئەگـــەر <کردەیـــەکی ڕامیـــاری "ناچـــارەکی"> هاوپەیوەسـت بـوو بـە ئەنجامـدانی <کردەیـەک> کـە لـەناو پانتایی پێوەرگەلێکی "<نەرێنییەت>"دا لە ئامادەباشـیدا بـوو؟ ... ئایـە لـێرەدا "نووسـەر-و-خوێنـدەوار" دەتـوانێت [یـاخود توانستی] ئەم کردەیە بگەیـەنێت بـە ئـەنجام؟ ... لـێرەدا دوو بەڵگەنەویست/ئارگیۆمێنت بوونیان هەیە :-

١) <دەتوانێت بەڵام ناتوانێت>

١) "نووسەر-و-خوێندەوار" دەتوانێت ڕامیارکاری بکات.

١.١) چونکە "نووسەر-و-خوێندەوار" دەتوانێت <کردەی ڕامیاری> بە ئەنجام بگەیەنێت.

١.٢) بەئەنجامگەیاندنی <کردەی ڕامیاری> هاوواتایە بە نەبوون بە "نووسەر-و-خوێندەوار".

١.٣) کەواتا :- "نووسەر-و-خوێندەوار" ناتوانێت ڕامیارکاری بکات.

٢) <ناتوانێت چونکە ناتوانێت>

٢) "نووسەر-و-خوێندەوار" ناتوانێت ڕامیارکاری بکات.

٢.٢) چونکە سەر بە ژێرخانێکی "هۆشگەرایانەیە".

٢.٣) "ژێرخانی هۆشگەرایی"، "لێکدژە" لەگەڵ <کردەی ڕامیاری>.



ژیان بە وشە نانوسرێت ... .بە کردار دەنووسرێت.. ئـەوەی بـیری لێ دەکەیتـەوە گرنـگ نییـە. تـەنها ئـەوە گرنگـە چی دەکەیت.

— پاتریک نێس

## به‌شی شه‌شه‌م: شه‌به‌نگی دوای-به‌عسگه‌رایی و ده‌رکه‌وته‌کانی

ده‌روازه

[١] ڕوونکردنه‌وه‌ی پێویست

[٢] دوایدۆخی به‌عس

[٣] به‌ئاکسیۆمبوونی ڕووکه‌شه‌ناوخۆ

[٤] مانه‌وه‌ی-بیرۆکه‌یی <به‌عسیزم>

[٥] ئێستاتیکای تواندنه‌وه‌ی ڕێکخراوه‌یه‌ک

[٦] دۆخی <پۆست-به‌عسیزم>

[٧] په‌ڕتووکه‌فه‌رهه‌نگی <پۆست-به‌عسیزم>

[٨] زیندووبوونی <سید الرئیس>

[٩] ئه‌سته‌مبوونی ئامانجه به‌عسییه‌کان

[١٠] ئه‌نجام

[دەروازە]

یەکێک لە هۆکارە سەرەکییەکانی ئامادەکردنی کۆمەڵێک دەقی فەلسەفی وەها؛ بریتی بوو لە دەرکەوتن و پێشڤەچوونی هەژموونە نەتەوەیی و بابەتە ناکۆکەکان. ئەو بابەتانەی کە هەتاوەکوو ئێستا چارەسەر نەکراون و تەنها وەلا نراون. وە وەلانانیش بریتی نییە لە چارەسەرکردن و ئەگەریەتی دەرکەوتنەوەشی هەیە.

[١]

سەرەتا پێویستە پرسیارێکی گرینگ بورووژێنین؛ ئایە بەعس چییە؟

پەیکەربەندی <ڕێکخراوەی بەعس> لە ڕووی دەسەڵات و جموجۆڵی هێزەکاندا؛ پێک هاتووە لە سێگۆشەیەکی دیاریکردراوی پەتی. کە ئەم سێگۆشەیە کەرت کردراوە لەبۆ دوو بەشی سەرەکی. کە ئەستەمە بەبێ ئەم دوو

بەشـە، ئـەم سێگۆشـەیە پرۆسێسـی خـۆی بەگشـتی بەگـەڕ بخـاتن. وە ئـەم دوو بەشـە؛ [سـەربەرەوخوار] پێک هـاتوون لە:- ١. ڕێکخراوەی بەعس بە گشتی. ٢. ڕێکخـراوەی بـەعس لـە لقی عـێراق + ڕێکخـراوەی بـەعس لـە لقی سـووریا. [لەوانەیـە] ئـەوەی جێگـەی پرسـیار بێتن لـێرەدا؛ بریتییـە لـە هەبوونی هەردوو لقی ڕێکخراوەکە لەناو بەشـی خـوارەوەی سێگۆشـەکە. بەیەکـەوەبوونیان لـێرەدا هاوواتایـە بـە بەیەکـەوەبوونێکی ناچـارەکی لـەبۆ "خزمـەتکردن-و- ملکـەچبوون" بـە ڕێکخـراوەی بـەعس بـە گشـتی. سـەربڵندکردنی بەشـی خـواروی سێگۆشـەکە، لـەبۆ سـەری سێگۆشەکە. ملکەچبوونێکی سێگۆشەناسییانە.

ڕەهەندی مێژوویی ڕێکخراوەی بەعس، پێک هـاتووە لـە سـێ پانتـایی جیـاکردراو. وە دەستنیشـانکردراو. ئـەم سـێ پانتاییـە، لـە هـەمان کاتـدا بەسـەریەکدا خزێنـدراون و هـەر

لەسەر ئەم بەسەریەکدابوونەشدا، بە تەواوەتی بە جیاوازی ئەم هێڵە مێژووییانە هاتوچۆ دەکەن. ڕاستەهێڵە-سەربەخۆکانی پانتایی مێژووی ڕێکخراوەی بەعس؛ بەگشتی پێک هاتووە لە:-

١) پڕۆتۆ-بەعس:- ئەو ڕووداوگەل-و-بیرۆکانەی کەوا بوون بە هۆکاری ڕێکخستنەوەی خودی ڕێکخردراوەکە. بەڵام سەرەکیترین تایبەتمەندی ئەم قۆناغە؛ بریتییە لە بیرۆکەی <عەرەب وەکوو نەتەوەیەک>. پڕۆسێسی بەنەتەوەییکردن هاوپەیوەند بە پڕۆسێسی <کۆمەڵگەرایی/سۆسیالیزم>ی "ئەوکات".

[٢]

لە دوای "ڕووخان" و "نەمان"ی هەر دۆخێک؛ ئەوا دۆخێکی دیکە دێتن لەبۆ بە ئارابوون. دەتوانین بە <دوای-دۆخ>ـەکە ناوەزەندی بکەین. کە پێک هاتووە لە:- دەستەبەربوونی

دۆخێـک، لــەدوای دۆخێـک. دەسـتەواژەکە، تـەنها ئەمەیـە:-

<دوایدۆخ>ـە.

بێشـک، لەوانەیـە دۆخێـک تێپـەڕ ببێتن. تێپەڕانـدنی دۆخێـک بگــاتن بــە ئــەنجام. وە بگــاتن بــە کۆتاییهــاتنێکی کتــوپت. لبەرئـەوەی؛ ئـەو کاتـەی کـەوا دۆخێـک دێتن:- پێشـمەرجی دۆخێک؛ هات لەبۆ ناو پرۆسێسی بەتێپەڕبوون.

چەمکی <دوایدۆخ>یش پـەتێکی تـاکی پێـوە لکـاوە. نـەوەکوو تەنها هەر پەتێک؛ داوێک:- لە ڕاستیدا ،دوایدۆخ> ئەم داوەی لە خودی <دۆخ>ی "ڕابردوو"ی دوایدۆخ ڕاکێشایە.

بـەڵام بـە جۆرێـک لـە جۆرەکـان؛ دۆخێـک کاریگـەری هـەر دەمێنێتن. دۆخێک کاریگەری خـۆی بـەجێ دەهێڵێتن. وە ئـەم کاریگەرییە، خۆی دەبینێتن لە نـاو کۆمـەڵێک بـوار و پانتـایی نیمچەسـەربەخۆی وەکوو:-

<هونەری میووزیکا>/<فەرهەنگ[ۆک}ی قسەکردنی ژیانی-ڕۆژانە>/<سێکتەرە-هەستەوەرییەکان>ی جەستەی مرۆڤ :- <<<نۆستالژیا>>>.

دوایدۆخی تواندنەوەی <ڕێکخراوەی بەعس>یش لە باشووری کوردستاندا، کۆمەڵێک دەرهاویشتە/دەرکەوتە لەگەڵ خۆیدا ڕادەخسێتن. وە ئەم <دوایدۆخ>ەی پاش <بەعس>:- ناوەزەند کردراوە بە <پۆست-بەعس>. وە بیگرە تەنانەت بە <بەعسییەتەکەی دوای بەعس>.

[٣]

<دوایدۆخ>ی هەر ڕژێمێک/ڕێکخراوەیەک، پێمان دەڵێتن کەوا :- [لە ڕاستیدا] ڕژێمەکان/دۆخەکان/ڕێکخراوەکان، تەنها بە فیزیکی-و-ڕووکەشی، لەناو دەچن.

[ئەگەرچی تەنانەت دەستەواژەی <لەناوچوون>یش، پڕبەپێستی خۆیەتی؛ چونکە تەنها لە <ناو> دەکەوێتن.

<لەناوکەوتن>. گۆڕین-و-بارگۆڕینی ناوێک لەبۆ ناوێکی تر...]

بەڵام خۆ ڕژێمەکان/دۆخەکان/ڕێکخراوەکان بە بیرۆکەیی هەر دەمێنن. [تەنانەت دەمێنن لەناو پانتایی هونەری و بەماددیکردراو/بەڕووکەشکردراو]

کە ئەمەش لە ڕاستیدا ئاکسیۆمێکە:- بەڵگەنەویستێکی ساکارە. بەڵام ئەم دەستەواژەیە وێنەدانەوەیەکی ئەوەندە نەزانـدراو نییە. وە تەنانەت بە هەبوونی برێک لە:- ئاگامەندی، ئەوا تەنانەت بەڵگەنەویستیشە.

هەڵبەت <بەڕووکەشەلەناوچوون>ی هەموو ڕێکخراوەیەک، پێشمەرجی <بەناوەخۆییبوون>ی خودی دۆخەکەیە؛ لەناو <پۆڵێنبەندییەکی بیرۆکەیی>دا. وە هاتنی ئەم دۆخە لەبۆ ناو پانتایی جیهانی بیرۆکەکانمان. کاتێک کە "بەعس ڕووخا"، ئەو بیرۆکانەی کەوا هاوپەیوەست بوون بە ئەم

دۆخـــە؛ ڕاگــوزەر کــردران لـــەبۆ دوایدۆخەکــە. دووبــارە بیرۆکەکان خۆیان تەشەنە کرد لەناو پانتایی هیزریدا.

[ئەگەرجڵی پێویستیش بوو کەوا] گوتارگەلێکی شـێوەوێنەیی وەکـوو :- "ئێمـە ئـەم پەرسـتگایە دەڕووخێـنین". هاوواتایـە بــە:- "ئێمــە تــەنها <ڕووکەشــی مــاددی> ئــەم پەرســتگایە دەڕووخێـــنین/دەیشـــارین". چونکـــە خـــودی بیرۆکـــەی پەرستگاکە هـەر بـوونی دەمێنێتن (سـەلمێندراو). بـەڵام چڵی جۆریک لەناو بـوون... :- هـەبوونێکی بیرۆکـەیی. <مانـەوەی بیرۆکەیی>.

<ڕژێمـــەکان/دۆخـــەکان/ڕێکخراوەکـــان> دەســـتەواژەی ڕووخانیـان/ڕووخانـدنیان؛ ئـا لـە ئـەم شـێوازەدا بەرجەسـتە دەکــردرێتن :- "نــەڕووخا؛ بــەڵکوو شــاردراوە!". [تەنانــەت ئەگەریـــــەتی بەئەســـــتەمبوونی واژەی ســــێیەمی ئــــەم دەســـتەواژەیەش دووبـــارە دەکـــەوێتن بـــەناو بۆشـــایی شککردن-و-پرسیارلێکردنەوە.]

لێرەدا ئێمە خۆمان لەپێش دەستەواژەیەکدا دەبینین؛ جۆرێک لە ئاکسیۆم :- <تواندنەوەی فیزیکی و مانـەوەی هـەمیشـەیی بیرۆکــەیی>. ئیــتر هیچی دیکــە مشــتومڕ-و-گارەگارەکــە لەســەر ئــەوە نــەماوە کــەوا ئــاخۆ ئێمــە چڵــۆن ئــەم ماددانە لا بدەین:- ئـەم شـتومەک-و-کەرەسـتانە لا بـدەین. <شــاردنەوەی ماددەکــان>. ئەســڵەن هەوڵدانــەکان تــەنها خۆمانـدووکردنێکی "بێئـەنجام" بـوون. چونکـە ناتوانـدرێتن بەتـەواوەتی ئـەم بیرۆکەیـە نـەهێڵین. لـێرەدا ئەسـتەمبوونی نەهێشـتن دووبـارە خـۆی لـەناو پرسـەکەدا دەخشـێنێتن و؛ پرسەکە دەستکاری دەکاتن.

[٤]

[هەڵبەتە] لەپاش ڕووخانی-فیزیکی <ڕێکخراوەی بـەعس بـە گشتی> و؛ بەتایبەتتر:- <ڕێکخراوەی بەعس :- لقی عێراق> [<حــزب البعث العــربي الإشــتراكي - قطــر العــراق> :-

ڕێکخـراوەی <بـەعس :- لقی عـێراق> بەشـێکە/لقێکـە لـە <ڕێکخـراوەی بـەعس بـە گشـتی>. نـاوبراو لـە سـاڵی ١٩٥٢ دامـەزرا.] ئـەوە دەبیـنین [و هــەروەکوو دەزانین] کـەوا لــە ڕاستیدا هێشتان ئەم ڕێکخراوە هەر بوونی هەیە. بەڵام چڵی جۆرێک لە بوون:- هەبوونێکی بیرۆکەیی. ئەمەش بریتییە لە هەبوونێکی بیرۆکەیی بەئەڕشیفکردراو-و-پارێزراو. جۆرێک لە <پاشەکەوتکردنی-هیزری>. کە لـە نـاو مێشـکی-فیزیکیـدا دووبــارە خــۆی بەرجەســتە دەکــاتن. بــە پێچەوانــەی <لەبۆچوونی-باو>؛ نەکاونـەوەکوو <ڕێکخـراوەی بـەعس :- لقی عێڕاق> چـەمکێکی <بـەتیۆریزەکردراو> ببێتن/بێتن، لـە ساڵی (٢٠٢٢)ی ئێستادا. [بێشـک لـە قۆنـاغی دەرکەوتنیشـیدا تیـۆریزەکردراوێکی وەهـا <<<نێزیکبیـک-و-دووربین>>> نــەبوو] بــەڵکوو <بەعسـیزم> و، بەتایبــەتتر <ڕێکخـراوەی بـەعس :- لقی عێڕاق> لـە ئێسـتادا، یـاخود پـاراوتر بیڵـێین:- <پۆســت-بەعســیزم>ــەکەی ئێســتا. نــاوبراو هــەبوونێکی

نووڕۆنۆلۆژیایی [Nûrronlojya] هەیە. [بەتایبەتتر لەناو پانتایی باشووری کوردستان/هەرێمی کوردستان؛ وە هەندێکجاریش ئەم تۆڕە درێژ دەبێتن لەبۆ ڕۆژهەڵاتی کوردستان و تەنانەت پارچە داگیرکردراوەکانی تریش] <بەتیۆریزەکردن> و خستن لەبۆناو پڕۆسێسێک لە پڕۆسێسگەلێکی تیۆریزەکردن؛ کردەیەکی پڕئەگەریەت ئەستەم دەبێتن. لێرەدا دەتوانین بڵێین کەوا "نیمچە-ئەستەم" دەبێتن. چونکە ئەم پڕۆسێسە تەنها دەستوپەنجەی لەگەڵ خودی ڕێکخراوەی <بەعسیزم>دا شل کردووە. وە بە تایبەتتر :- <ڕێکخراوەی بەعسی-عێراق> هاوپێچ بە داهاتووی <ژیانێکی-باشتر>. نەوەکوو هەرهیچ تیۆرییەکی <ڕێکخستنەوەی برا-عەرەبەکان>مان بێتن یاخود جۆرێک لە ڕێکخستن بێتن کەوا تیایدا <گەلانی-عەرەب> "یەکگرتوو" ببن.

بە گوێرەی لێکۆڵینەوە سەرەتاییەکان :- لـە سـاڵی (٢٠٢٢)دا، هیچ هەوڵدانێکی وەها نابینیدرێتن لـەبۆ "زیندووییڕاگرتنـەوە" و <درووستکردنی ڕێکخراوەی:- یەکگرتوویی عەڕەب>. وە بـــە تایبـــەتتر :- درووســـتکردن-و-"زیندووکردنـــەوە"ی ڕێکخراوەیـــەکی یـــەکگرتوویی عـــەڕەب، بـــە بـــەکارهێنانی <میتۆدگـەلێکی ڕێکخـراوەی بەعسـی-عـێڕاق>. یـاخود هـەر میتۆدگـەلێکی <سـیانە پیرۆزەکـەی بەعسـیزم> بێتن. ئێمـە لـــێرەدا دەبیـــنین کـــەوا چەنـــد ئەســـتەمە میتدۆگـــەلێکی <ڕێکخراوەی بەعسی گشتی> بێتن لـەبۆ بـەکاربردن. لەبـەر ئەوە، تاکە ژوور کە بـە ئەگەریـەتێکی کەمیشـەوە بێتن، ئـەوا دەبێت میتۆدگەلێکی <ڕێکخراوەی بەعسی-عێڕاق> بێتن. وە ئەگـەر هەشـبێتن: ئـەوا زۆربـەی لـە بن پێنـووس و لەسـەر کاغەزەکانـدا بـەرەواژوو دەکـردرێتن. یـاخود لـە هـەراتترین بـاردا :- لـە نـاو لاپـەڕەکانی تۆڕەکـانی سـەرهێڵدا دەمێنن. وە :- بێجگـــە لـــە کاغەزمەرەکـــەبێک و ڕێکخـــردراوێکی

مەرەکەب لەگەڵ هەندێک <نووسراوی ·دیجیتاڵی>، هیچ کردەیەک بە ئەنجام ناگەیەندرێتن. نەوەکوو لەبەر ئەوەی کەوا ناتواندرێتن :- بەڵکوو لەبەر ئەوەی کەوا هەر تەنانەت <لەباربوونی-دۆخێک> لێرەدا ئامادە نییە و لە ئارادا نییە، هەتاوەکوو ئەم پڕۆتۆ-تیۆریزەکردنە بهاویت/بیسەپێنیت لەبۆ ناو پانتایی کردار.

لە ئێستادا، ساڵی (٢٠٢٢) :- ماددە-خاوەکەی <بەبەعسبوون> بەردەست نییە. یاخود ماددە-خاوەکەی <ڕێکخراوەی بەعسی گشتی>. وە تەنانەت <ڕێکخراوەی بەعسی-عێراق>یش.

نەبوونی ماددە-خاوەکە هاوواتایە بە نەبوونی بیردۆز/تیۆر. چونکە خودی <ماددەی-خاو>ی ناوبردراو، هیچ بیردۆزێکی لە پێش نەبووە. بە هۆکاری لە پێش نەبوونی هیچ بیردۆزێک لە پشتی ماددەی-خاودا. ئەوا ماددەی-خاو هەر بە هەمان ناو دەمێنێتن:- <ماددەی-خاو>.

>ڕێکخراوەی بەعس< بەرهەمی کۆمەڵێک لە بیردۆزە. بیردۆز لەگەڵ بیردۆزدا. بەکارهێنانی بیردۆزێک لەسەر بیردۆزێکی تر. سێتی بیردۆزەکانی عەبسیزم هاوپەیوەندە بە :- >پرسی عەرەب</>پرسی ناعەرەبەکان</>دووبارەپێناسەکردنەوەی عەرەب</>بە چەمککردنی واژەی عەرەب<.

بەبێ هەبوونی ماددەیەکی-خاوی ناوبردراو، [یاخود تەنانەت بگرە هەر جۆرێک لە ماددە بێتن.] ئەوا هەر بەگەڕخستنێکی پڕۆسێسی >بەماددەییبوونی بیرۆکەیی<ی ناوبردراو، هەڵدەپاسێتن و ناگات بە ناو پانتایی تەنەکان/ماددە.

[٥]

لە دوای >تواندنەوەی-ڕێکخراوەیی< و ڕووکەشی فیزیکی >یەکیەتی سۆڤیەت<[ناوی فەرمی :- یەکێتیی کۆمارە-سۆسیالیستەکانی سۆڤیەت. کە، لە ڕێککەوتی (٢٦ی

دیسێمبەری ١٩٩١)دا هەڵوەشێندرا به شێوازێکی ڕێکخردراو و هاوکۆک.] هەڵبەته هەروەکوو ئاشکرایە، ئەمه تواندنەوەیەکی ماددی بوو.

ئاکسیۆمێکی دیکه :- [لێرەدا ئێمه مەبەستمان له ماددییەتبوون، وه <بوونێک له ناو مادده>دا، بریتی نییه له لەناوچوونی-تەواوەتی خودی بیرۆکەکه. بەڵکوو؛ بریتییه له تەنها "ڕووخاندن"/گۆڕینی ناوی باڵەخانەکان و بنکە-سەرەکییەکان. ئەگەرنا به کەلتوور و کەلەپوور، وه تەنانەت به بیرۆکەش هەر مایەوە/دەمێنێتن.] هەروەکوو هاوشێوەی هەموو ڕژێمێک/پەیڕەوێک.]

بەڵام ئایه دەبێتن چڵی جۆرێک له هونەر بەدەست بێتن هەتاوەکوو ڕێکخراوەیەکی وەکوو <یەکیەتی سۆڤیەت> هاوپەیوەست بکاتن به ڕێکخراوەیەکی وەکوو <بەعس>. وه بەتایبەتتر :- <ڕێکخراوەی بەعسی-عێڕاقی>.

لە ڕاستیدا کێشمەکێشمە سەرەکییەکە لەسەر ئەم پرسە نییە کەوا ئـەم دوو ڕێکخـراوە زەبەلاحـە هاوپەیوەنـد بن. بـەڵکوو لـە ڕووی <هونـەر>ییـەوە. ئـەم دوو ڕێکخـراوە، دابڕانێک و دەرەزێکی مەزنیان هەیە لەنێوان یەکتریدا.

ڕێکخراوەی <یەکیەتی سۆڤیەت> وەکوو کەلـەپوور. وەکـوو جۆرێک لە مێتا-ئێستاتیکا. هێشتان بە هەل دەزاندرێتن لـەبۆ گشـــت پڕۆتـــۆ-سۆســـیال/کۆمۆنیســـتەکانی جیهـــان. وە بەتایبـەتتر خـودی ئـەو تاکانـەی کـەوا بـە فـیزیکی لـەنێو وڵاتەکانی <پاش-یەکیەتی سۆڤیەت>دا دەژین.

ڕەنگی سـووری "تاریـک". [هێکسەدیسـیماڵ/ :- CC0000] وە هـــــەروەها لەگەڵـــــدابوونی ڕەنگی زەردی "تاریـــــک" [هێکسەدیسیماڵ :- FFD700]. <بەئێستاتیکا>بوونی ڕەنگ و لێکەوتە-هونەرییەکانی ڕێکخراوەی <یەکیەتی سـۆڤیەت>، بــە تــەواوەتی جیــاواز و دابــڕاوە لــە هــەر جۆرێــک لــە ئەگەریــەتێکی <بــوون بــە ئێســتاتیککردن>ی ڕێکخــراوەی

<بەعسی لقی عێراق>. وە تەنانەت <ڕێکخراوەی بەعسی گشتی>ش.

لێرەدا ئێمە خۆمان دەبینین لە سەبارەت بە پرسیارێکی نقوومبوو لە ناو ئێستاتیکادا، کە ئەمەیە :- ئایە ڕێکخراوەی <بەعسی لقی عێراق> چڵی جۆرێک لە ئێستاتیکای بە جێ هێشت. یاخود بیگرە ئاخۆ هەر ئایە هیچ جۆرێک لە دەرکەوتەی-ئێستاتیکایی فڕێ داوە یاخود چڵی.

تەواوپێچەوانەی "ئێستاتیکای یەکیەتی سۆڤیەت"، لەنێو پانتایی هونەری ڕێکخراوەی <بەعسی لقی عێراق>، هیچ جۆرێک لە <ڕەنگ> بەدی ناکردرێتن. نەک تەنها ڕانگدار نییە. وە هاوپەیوەند نییە بە هیچ جۆرێک لە ڕەنگ.

لێرەدا خاڵی سەرنجڕاکێش ئەمەیە :- ئایە چڵی جۆرێک لە ڕەنگ، چڵی ڕەنگێک لە شەپەنگی ڕەنگەکان، لە ناو <ڕێکخراوەی بەعسی عێراق> وە تەنانەت ڕێکخراوەی <بەعسی گشتی>دا بوونی هەیە. لە ڕاستیدا. دەتوانین بڵێین

کەوا ڕینگەکانی ڕێکخراوەی بەعس ئەوەندە بردراون بەناو پرۆسێسێکی <بەگوێرەگەرایی>/<ڕێژەگەرایی>، ئەوا ئەم پرۆسێسە خۆی سەپاندووە بەسەر پرۆسێسێکی بەرتەسکی یـــــەکرەنگی یـــــاخود دووڕەنگی هاوشــــــێوەی ڕژێم و ڕێکخراوەی <یەکیەتی سۆڤیەت>.

ڕاکێشانی خاڵێکی ئێستاتیکا-سەنتەر لەبۆ ناو "سەردەمی ئێستامان" و :- بە تایبەتتر ساڵی (٢٠٢٢) :- ئەوا دەبینین کەوا لێرەدا ئێمە دەتوانین دیاردەیەکی ئێستاتیکی وەکوو :- <بەدوومـــەربوون> وەربگـــرین. لـــە نـــاو ئـــەو هەوڵـــەمان سەبارەت بە ڕاکێشاندنی ڕاستەهێڵێک لە ڕابردوو لەبۆ ئێستا.

ئایە لەبەرچی دەبێتن <دوومـــەرەکان> ڕووســی بن... بـە <ڕووسی-زمان>بوونی دوومەرەکان هاوواتایە بە چڵی جۆرێک لە دەرکەوتە و ئەندێشەیەک ...

>دوومەرەکان< بە پلەیەک ماددە-هۆشبەرەکەیان بریتییە لە میووزیک. بەڵآم چلّی جۆریک لە میووزیک ...

میووزیکێک کە هەر لە ناو هەمان سێتی >بوون بە دوومەر<بووندا خۆی مەڵاس دەداتن.

Doomer Music vol.1

>میووزیکای دوومەرخوازانە :- کۆکتێلی یەکەم<.

Doomer Music vol.2

>میووزیکای دوومەرخوازانە :- کۆکتێلی دووەم<.

Doomer Music vol.1-25

>... کۆکتێلێکی ٢٤-٢٥...<.

بەڵام لە ڕاستیدا >دوومەرەکان< خۆ هەر تەنها گوێگری >میووزیکای:- دوومەری ڕووسی< نین. بەڵکوو گوێگری >میووزیکای :- دوومەری خۆکوژی<شن.

>ئێستاتیکای بەدوومەربوون< بریتییە لە تۆڕیکی-ئێستاتیکایی گشتگیر و سەرتاپاگیر. ئەم تۆڕە لە وێنەی

شێوەجاڵجاڵۆکەیەکدا خۆی دەبینێتن. چەقێکە کەوا هەندێک لق-و-پۆپی لێ "بەستەردراوە". لە چەقی ئەم تۆڕەدا، ئامڕازێک، سیمبوولێک <داندراوە>. پیتی <غ>. <غ>ەکە! :- غەم. بەڵام لێرەدا ئێمە دەبێتن وشەکە پاراوتر بکەینەوە.

سێتی {غەم} :- ئەندامەکانی :- ١) <ئەو-هەستەی-کەوا-تەنهایت> ٢) <ئەو-هەستەی-کەوا-تەواو-بوویت> ٣) <ئەو-هەستەی-کەوا-"نەرێنیت" ...

لە یەکێک لە گۆرانییەکانی باندی بێلاڕووسی <مۆڵچات دۆما/Molchat Doma> لە ژێر ناونیشانی :- <کلییێتکا/kletka>. وەکوو لەبۆوێنەیەک وەردەگرین سەبارەت بە پرسەکەمان. وە گرینگترین بەشی ئەم تێکستە-هەڵبەستە، [بە لەبۆچوونی خۆم] شەش دێڕی سەرەتای تێکستەکەیە. کە وەهایە:-

دێڕی یەکەم:-

ک:-

١. ئەمە گەڕەکەکەیە

١.١ ئەم گەڕەکە

ئ:-

This is the street

ڕ:-

И вот, эта улица

دێڕی دووەم:-

ک:-

٢. بچیت/بچۆ [بۆ] باڵەخانەکە

٢.١ بچیتە باڵەخانەکە

ئ:-

Enter the building

ڕ:-

Войди в этот дом

دێڕی سێیەم :-

ک:-

٣. بچیت/بچۆ [بۆ] نهۆمی هەشتەم

٣.١. بچیتە نهۆمی هەشتەم

ئ:-

Go up to the eighth floor

ڕ:-

Поднимись на восьмой этаж

دێڕی چوارەم:-

ک:-

٤. زەنگەکە لێ بدە

٤.١. زەنگەکە لێ یە

ئ:-

Ring the bell

ڕ:-

Позвони в звонок

دێڕی پێنجەم:-

ک:-

٥. لە دەرگاکە بدە

٥.١. لە دەرگا دە

ئ:-

Knock on the door

ڕ:-

Постучи в эту дверь

دێڕی شەشەم:-

ک:-

٦. وە کەس بۆت ناکاتەوە

٦.١ کەس بۆو ناکاتەوە

ئ:-

And nobody will open it for you

ڕ:-

И тебе никто не откроет

تەواوی تێکستەکە:-

١. لەم گەڕەکە.

٢. ئەم خانەیە.

٣. نهۆمی هەشتەم.

٤. زەنگی لێ بە.

٥. لە دەرگا بە.

٦. کەس ...

بەڵام هەڵبەتە ئەم جۆرە لە وەرگێڕاندنە، هاوپێچکردنەوەیەکی وەرگەڕاندنە لەبۆ <زمانی کوردی>. پرۆسێسێکی <بەکورد-زمانکردنی تێکستێک>. لە پای پرۆسێسێکی <بەئینگلیز-زمانکردنی تێکستێک>. ئایە چلۆن وەها لە خودی ئەم تێکستە بکەین، وەرگەڕاندنێکی وەها کە هەمان هەستبزواندن بگەیەنێت لە زمانێکی تردا... لە

باشترین دەستەواژەدا و نزیکتر لە "پڕبەپێستبوون"ی، دەتوانین ئاماژە بەوە بدەین کەوا:- <دوومەرەکان> دەبێتن ڕووس-زمان بن. چیما خۆ ناتوانن ڕووس-زمان نەبن.

لێرەدا ڕادیکاڵترین [[Radîkall خوێندنەوە لەبۆ ئەم تێکستە، [وە بە ئەگەریەتێکی زۆرەوە لەبۆ خودی تێکستەکانی تریش. تێکستگەلێکی دەرەوەی ئەم تێکستەش.] بریتییە لە ئەوەی کەوا تەنانەت ئەم کێشمەکێشمە هونەردۆستانەییە-و-ئێستاتیکییە، هەر تەنانەت هاوپێچ/هاوپەیوەند نییە بە خودی تێکستی گۆرانییە/پارچە-میوزیکایەکە.

گرینگ نییە کەوا ئاخۆ بەرهەمێکی-هونەری <مۆڵچات دۆما/Molchat Doma> بە ناوی <کلییتکا/kletka>، چڵی جۆرێک لە تێکست لە خۆی دەگرێتن.

ئایە پرسەکە سەبارەت بە ئەوەیە کە ئاخۆ کۆمەڵێک <وەهاگۆتن> و <وەهالەبۆچوون> ڕێک بخرێردرێن لەبۆ

خودی پارچە-میوزیکایەکە. یاخود ئایە هەر تەنانەت خودی تێکستەکە گرینگ نەبووە ...

کۆمەڵێک لە وەهاگۆتنی وەکوو:-

"ئۆها! ئاخۆ ئەبێ ئەم تێکستەی باس لە چی بکا..."/"ئەم تێکستە زۆر کاریگەرە"/"ئەم تێکستە غەمهەژێنە"/"ئەم تێکستە..."/"ئەم..."

لە ڕاستیدا ئەگەر <مۆڵچات دۆما/Molchat Doma> تراکەکەی بە ناوی <کلییێتکا/kletka> نەبووایە و، شەش دێڕەکەی سەرەتای خودی تراکەکە وەها نەبوونایە، ئەوا هیچ لە خودی پارچە-میوزیکایەکە "<نە کەمی دەکرد وە نە زیادی دەکرد>".

<بەئامپلیفاکردن/Beempllîfayîkirdin>ی خودی تراکەکە هاوپەیوەند نییە بە <بەئامپلیفاکردن>ی خودی تێکستەکە. لێرەدا بگرە خودی تێکستەکە، پارچە-میووزیکایەکە لەسەر خودی پارچە-میووزیکایەکە. دوو پارچە-میووزیکا لە

هەمئاهەنگیدان لەبۆ وەشاندن و ورووژاندنی ئەو هەستەی کەوا لەنێو ئێمەی هۆمۆ-ساپیاندا بوونی هەیە.

[٦]

<دۆخی پۆست-بەعسیزم> [بە پێچەوانەی دۆخی وڵاتانی پۆست-ی.سۆڤییەتی] لەناو کەلتوور و کەلەپوور، وە هەروەها "هونەر"دا خۆی نابینێتن و؛ خۆی بەرجەستە ناکاتن. بەڵکوو: هەر وەکوو بیرۆکە؛ بیرۆکەیەک، خۆی دەردەخات. بەڵام چی جۆرێک لە بیرۆکە؛ <ساندرڕۆمی ستۆکهۆڵم [Sandirromî stokhollm] > بە جۆرێک لە جۆرەکان. <زۆربلێی تاک-بیرۆکەیەک> بە جۆرێک لە جۆرەکان. خودی بە جۆربوونی ئەم دیاردەیە.

نەک تەنها لە ناو جیهانی بیرۆکەکاندا خۆی لەبەر دەگرێتن. بەڵکوو لەناو باڵەخانەکانیشدا. <دۆخی پۆست-بەعسیزم> :- هاوواتایە بە ئەم دۆخەی کەوا لە دوای

تواندنەوەی ڕێکخراوەی <بەعسی گشتی :- لقی عێراق>دا هاتووە. <پۆست-بەعسیزم> لەناو ئەو شوێنانەدا خۆی دەبینێتن کەوا درووستکردراو-و-پێکهێندراوی ڕێکخراوەی <بەعس لە لقی عێراق>دا بوون.

[٧]

ئەگەر ئێمە سەرنج بدەین لەبۆ ژیانی ڕۆژانەمان، وە بەتایبەتتر <زمانی ژیانی ڕۆژانە>مان. ئەوا دەبینین کەوا فەرهەنگی قسەکردنمان:- ئەو کامە-فەرهەنگەی کەوا لە ناو لەخۆڕاییەکی-نائاگامەندی، بەکار دەهێنین. بە لەناکاوی، پڕە لە دەستەواژەی <پۆست-بەعسییەت> و <بەعسییەتەکەی دوای بەعس>. ڕشاندنەوەی کۆمەڵێک واژەی هاوپێچ و هاوپەیوەست بە پڕۆسێسگەلێکی ئاوێتەیی "سیانەی پیرۆز"ی <١) پڕۆتۆ-بەعسیزم + ٢) ناوەندە-بەعسیزم + ٣) پۆست-بەعسیزم>. تەنانەت خودی ئەم ڕشاندنەوانە ناگەن

بە ئەم لەبۆچوونە زەقەی <پڕۆتۆکەی-پۆست-بەعسیزم>یش (کە ئەستەمە ئەم دۆخە ئەسڵەن لەناو ڕەوەندە مێژووییەکەدا بەرجەستە بووبێتن. چونکە؛ لە ڕاستیدا هەر هەمان وشە، هاوواتا و یەکجۆرە لەگەڵ <ناوەندە-بەعسیزم>.

ئەمە تەنها خۆپاککردنەوەیەکی <باشوور x ڕۆژهەڵات> و <باشوور بە هاوداو بە ڕۆژهەڵات>. لە ئەم تاوانە مەزنەی کە ئەنجاممان دا. خۆمان ببینەوە بە هەمانخاوەنی شکۆی خۆمان ...

[[][][][][]]]]]<<برگەی تێچوونی چیرۆکی>>>>>>>>>>>>>>>>>>>>>>>>

<<<کاتێک نەهێڵ ئەگەڕایەوە لە پەڕتووکخانەکەی نزیک ماڵیان، کیتابێکی ڕەنگ سووری تاریک، لە نێو زبڵدانێکی جیرانەکەیان خۆی حەشار دابوو. هەڵبەتە، نەهێڵی ساویلکە و سەرسەرکەش، بە ڕاکەڕاک لەبۆ پەڕتووکەکە داکەت.

ئـەوەی بینی بـاوەڕی پێ نـەکرد. چاوەکـانی بـەش کـردەوە.

لەبەرخۆیـەوە ئـەیگوت :- ئـەم گەنجینەیـە! ئـەبێ بـە ئـاکتیڤی

نیشان بەم!

کاتێک کە نەهێڵ کیتابەکەی داکەتاند، وەها بوو:-

$

یەکێک لە فەرهەنگەکان...

<فەرهەنگی دوای-بەعس> : Ferhengî post-be's

• ساڵی چاپ:- ١٩٩١.

چاپی دووەم :- ٢٠٠٣.

چاپکردنەوەی بەردەوام :- ١٩٧٩-٢٠٢٢...

• تیراژ:- (5,000,000)ی خەملێندراو.

ناوەوەی فەرهەنگەکە:-

سـەبارەت بـە ماتریاڵـەکانی نـاوەوەی پەرتووکەکـە. نـەهێڵ و

ئاکتیڤ کەوتنە گۆتن:-

>>نەهێڵ :- ئەم فەرهەنگە لە کۆمەڵێک وشە پێک هاتووە!

>>>ئاکتیڤ :- هاها! چڵی بەڵگەنەویستێکە! من پێویستم بە شیکردنەوەی-فەرهەنگی نییە. تەنها پێشاندانەکە گرینگە.

>>>نەهێڵ :- باش... بنوارە!

[لاپەڕە ٦٨٤ی پەڕتووکی فەرهەنگی پۆست-بەعسیزم] :-

"سەددام پیاو بوو".

[لاپەڕە ١١٩٤ی پەڕتووکی فەرهەنگی پۆست-بەعسیزم] :-

"بە سەددام دەکرا".

[لاپەڕە ١ی پەڕتووکی فەرهەنگی پۆست-بەعسیزم]

:- "سەددام وا بوو..."

>>>نەهێڵ:- ئەسڵەن هەزاران واژەی <سەددام وا بوو> بەردەستە لەنێو ئەم فەرهەنگۆکەدا. خۆ بۆ چی ئەبێ گەر سێ واژەت پێ نیشان بدەم. چونکە ئێمە هاوکێشەکەمان دۆزیوەتەوە! بنوارە :-

وادابنێ:-

١) ناوبراو + ٢) وەها + ٣) هاوەڵناوێکی بەهادار + ٤) بوو

>>>ئـــاکتیڤ :- هممممم، وادیـــاره هاوکێشـــه"کـــەت"

چوارینەیەکی مایەپووچە! بەڵام خۆ هەر ئیشی خۆی ئەکا.

>>>نەهێڵ :- ئەرێ ئەرێ. ئاتۆ بەس سەیر کە :-

.

،

،

سەددام "پیاو" بوو.

سەددام "بەهێز" بوو.

سەددام "مەرد" بوو.

.

.

.

>>>ئاکتیڤ:- تەواو تەواو زانیم. ئەڵێی لـە مەقـەڕی بەعسم

ماڵتا.

هەر وەکوو دەبینین، فەرهەنگی زمانی ڕۆژانەی پۆست-بەعیسیزم. وشەگەلێک دێتن لەبۆ گۆتن. بەڵام هەر تەنها لەبۆ گۆتن. لە چوارچێوەی ئەم سێتە-گۆتنەدا ناچن لەبۆ دەرێی خودی سێتە-گۆتنەکە. یاخود هەر وەها دیارە. [کە ئەمەش داهاتوویەک دیار دەکاتن کە ئاخۆ ئەگەریەتی هاتنی ئەم داهاتووەش بوونی هەبێت یاخود نەخێر.

>>>نەهێڵ:- ها. ها. پێکەنینی بێکۆتا! دڵنیام دڵنیام ساڵی (٢٠٢٤) ڕوودان دەبێت! (٢٠٢٤) ساڵی خۆمان ئەبێ!]

ئەوەی سەرنجڕاکێشە لەم فەرهەنگەدا ئەوەیە کەوا ناوی کەسێک هاتووە. ئاخۆ دەبێتن ئەم کەسە کێ بێتن... شتێکی وەها نییە! تەنیا ناوی کەسێکی سادەیە بە <ناو>ی سەرەکی :- <سید الرئیس> ناوەزەند کردراوە لەلایەن پرۆتۆ-شۆڕشگێڕە-سەددامییەکانی تۆڕەکانی سەرهێڵ [ Şorrşigêrrekanî serhêll/internet]. ناوبراوی

سەرەکی :- ئەم کەسە، تۆزێک خاکییە. کەسێکی نیمچە-شیکە.

[٨]

ئایە لەبەر چڵی پرسی <زیندووبوونی سید الرئیس> کەمێک سەیرە ...

خوێنەری بەڕێز، لەلاتان سەیر نەبێتن ئەگەر لە "داهاتوویەکی-نزیک"دا ئەم سەرەدێڕە بەناونیشانکردراوە خنجیلانەتان بینی :-

///<سید الرئیس> زیندووە و دێتن هەمووومان ڕزگار دەکاتن.///

[تۆڕەکانی سەرهێڵ]-[تۆڕەکانی گۆتن]

ئێمە هەمیشە پێویستیمان بە ڕزگارکەرێک هەیە. خۆمان ناتوانین هیچ بکەین. هەرگیز خۆمان لە پێگەی وەها بەرپرسیارییەتییەکدا نابینین کەوا تیایدا هاریکاری-و-

یارمـــەتی بەرامبـــەرەکانمان و ئەوەکانیکـــە بـــدەین. هەمیشـــە دەبێتن کەسـێکی دیکـە، یـەکێکی دیکـە؛ ئەسـڵەن گرینـگ نییـە کێیە. گرینگ ئەوەیە کەوا >>>خۆم<<< نییە!

][][]][][][[[[<<بڕگـــــــــــــەی تێچـــــــــــوونی چیرۆکی>>>>>>>>>>>>>>>>>>>>>

<<<نـــەهێڵ:- وادیـــارە یـــەکێک لـــە تیۆرزانـــە هـــەرە پێشـکەوتووەکانی ئـەم بـوارە، کـە جێگـای دەسـتوپەنجەی دیارە لە :- بەبەردەوامی لـە هەوڵدان دایـە لـەبۆ ناسـاندن و "تەنها" لێکۆڵینەوەی-زانستی لەسەر خودی دۆخەکـە ئـەنجام دەداتن. بریتییـە لـە کەسـایەتی زۆر بـەڕێز :- MstafaUK. ئایـە پێویسـت ئـەکاتن کـەوا نـاوی ئـەم بـەڕێزە بـە "کـوردی" بنووسـین[...]! نـاوبراو بەرهەمـە سـەرەتایی و گرینگەکـەی >میشێل ئەفلەق<ی [في سبيل البعث] بە شێوازێکی زانسـتی خوێندووەتـــەوە و، لـــە دوای لێکۆڵینەوەیـــەکی زۆر. لـــەبۆی دەرکـەوتووە کـەوا نـاوبراوی سـەرەکی، بێشـک دەبێتن ئـەم

ڕەوەنـدە ببـات لـەبۆ ترۆپـک! وە ئەمـەش بەڕاسـتی جێگـای دەستخۆشییە! وە ناوبراوی سـەرەکی، بەبـەردەوامی لەسـەر هێڵدایــە لــەناو تــۆڕە-ســـەرهێڵییە کۆمەڵایەتییــەکان لــەبۆ برەودان بەم دۆزە پیرۆزە و بـە بـەرز هێشـتنەوەی! وە لـەم دواییانـەدا، یـەکێک لـە بەرهەمـە پـڕ گرینگـەکانی نـاوبراوی سـەرەکی، هاتـە بڵاوکردنـەوە. هەڵبەتـە، نـاوبراو کەسـێکی سادەشـە! چمـا خـۆ ئـەو نایهـەوێتن بیرۆکـەکانی وەهـا بـە ئاســانی بــەربڵاو بکــاتن وەکــوو هەنــدێک لــە نووســەرانی دەسـتەبژێر! نـەخێر نـەخێر! چێ چێ چێ! ئـەو جیـاوازە! هـەر تـەنها بـە بەرهـەمێکی ڤیـدیۆگرافیک لێکۆڵینـەوە-زانسـتییەکی دەردەخات. ئا هـەر لـەم ماوەیـەدا، نوێـترین لێکۆڵینـەوەی بـە نــاوی :- <پەیوەنــدی تەلــەفۆنی ســـەدام حســێن لەگــەل تــــرەمپ> دەرهێنــــا. وەرگــــێڕانێکی تــــەواو-پتــــەوی وەرگێڕدراوێـک لـە ڤیـدیۆگرافیکێکی تـر بـە نـاوی :- مکالمـة هاتفیــة بین صــدام حســین وتــرامب. بەڕاسـتی ئەمــە زۆر

دڵخۆشـــم دەکـــات کاتێـــک کـــە دەبینم دوو مـــرۆڤی بـــە نەتـــەوە/ڕەگـــەز جیـــاواز، هـــەردووکیان هـــەوڵ دەدەن لـــەبۆ سەرخستنی دۆزە گرینگەکەیان!

هەڵبەتـە ئەمـە ئاکسیۆمە لـەبۆ هـەر کەسێک کـەوا هـەر خـۆ تەنانـەت (١%) [یـاخود (٠،١%)] هۆشـدار بێتن. ئـەوا خـۆ دەزانێتن کەوا <سید الرئیس> مردووە. وە بـووە بـە یـەکێک لە کەسایەتییەکانی ڕابـردوو. وە لـە ڕووی فیزیکیبوونییـەوە، هیچ پەیوەندییـەکی بـە ئێسـتاوە نییـە. (هەڵبەتـە جۆرێـک لـە هاوپەیوەندییـەکی سـایکۆ-بـایۆلۆژی بـوونی هەیـە لـەنێوان هاندەرانی مردووەکە).

ئـــاخۆ لەبـــەرچی دەبێتن <ســـید الـــرئیس> بـــە زینـــدوویی بهێڵـــدرێتن لەلایـــەن <کۆمـــەڵگا>وە... چڵی لـــە ژێـــر ئـــەم پڕۆسێس و دیاردەیە خـۆی شـاردووەتەوە و خـۆی مـەڵاس داوە.

هەڵبەتــە هەنــدێک خــاڵی ســەرەکی دەبن بــە هۆکــاری >بەزیندووڕاگرتنی سید-الرئیس<.

١) هانـدەرە سـاکارە [زۆربینـە]هـەرزەکارەکانی، کـە وەهـا دەزانن هــەر کردەیــەکی پــۆزەوزەی-ڕووکەشــی، لــە نــاو پانتاییـــەکی جیۆگرافیـــا-ڕامیاریـــدا، وە بـــە تایبـــەتتر بــەکردارکردنی پڕۆسێســێکی بیرۆکــەیی ســەبارەت بــە کردەیــەکی ڕامیــاری:- هاوپەیوەنــدە بــە درووســتکردن و ئاشــکراکردنی هــەر کردەیــەک و ویســتنێک/ویســتێک لــەبۆ >ژیانێکی-باشتر</>دۆخە-باشەکە<.

٢) هاندەرە ساکارە شەقامییەکان، ئەوانەی کە بە تـەواوەتی باوەڕیـان وایـە کـەوا هـەبوونی ڕووکەشـەوزەیەکی وەکـوو >سید الرئیس< تاکە چارەسـەر و تەنهاوتەنهاییـەکی ڕەهایـە لـەبۆ بـەکاربردنی ئـەو پڕۆسێسـەی کـەوا هـەر هیچ نـەبێتن، نێزیکترمان دەکاتن لەبۆ ">دۆخە-خۆشەکە<".

٣) لێرەدا ئەسڵەن هەر قسەکردنێک لەسەر ئەگەریەتی <بەئەکادیمیکردن> و، ڕاشکاوانەتر :- <بەبیردۆزکردن/بەتیۆریزەکردن> لەلایەن هەندێک لە "ڕۆشنبیرانی" بواری <نەتەوەسازی-عەرەبی/ناسیۆنالیزمی عەرەبی>، جێگای شکە. چونکە جێگەی سەرسووڕمانە بە جیهانبینین و لەبۆچوونەوەیەکی <بەعس>، بتواندرێتن وەها لە "ڕۆشەنبیرەکانی" پڕۆتۆ-عەرەب بکاتن کە هەر هەوڵدانێک لەبۆ <ڕێکخستنەوەی برا عەرەبەکان> بە ئەنجام بگەیەنن. چونکە دەبێتن سەرەتا <عەرەب> پێناسە بکردرێتەوە لەلایەن "ڕۆشەنبیرەکان"ی ناوبراو و، وە پاشان لە هەمووی چارەنووسسازتر :- پرسی <یەکگرتنی عەرەبەکان> پێناسە بکردرێتەوە. ئایە یەکگرتنەوەیەک لەسەر بیردۆزی بەعس، ڕێتێچووە و "خەون-و-ئاوات"ەکانی برا-عەرەبەکان دەگەیەنێتن بە ئەنجام یاخود ئەمە تەنهە بەهەڵەلەیەکتێگەیشتنێکە. یان ئەوەتا دەبێتن

وەکـــــوو "ڕۆشـــــــەنبیریێکی" نـــــاوبراو، "بـــــیردۆزی" <بەبەعسیکردنەوەی پۆست-بەعس> وەلا بندریێتن چونکە هەمئاهەنگ نییە لەگەڵ ئامانجە بنەڕەتییەکانی ڕەوەندەکە. یاخود دەبیێتن هەر بە هەمان هەوڵدانی سیێسەد-و-شیێست پلەییدا بخوولیێندریێنەوە و لە چەقوفەلەقیێکی <پیێش.٠بەعس لەبۆ بەعس پاشان دوای-بەعس>دا بخوولیێندریێنەوە.

٤) ترسیێکی ڕیشەیی و پڕایمۆڕدیاڵی-بیێدەستکاری لەلایەن پڕۆتۆ-کوردەکانەوە سەبارەت بەوەی کە ئاخۆ دووبارە کارەساتیێکمان بەسەردا دەهیێننەوە. دووبارە ئەنفالمان دەکەن. دووبارە <سەددام> دەگەڕیێتەوە هەتاوەکوو سزامان بدات. باوکی پیرۆزمان دەگەڕیێتەوە هەتاوەکوو نەوەکەی بەو سزایە بگەیەنیێت کە پیێی دەگوتریێتن <ئاساییەت> و <ئارامییەت>. لەلای پڕۆتۆ-کوردەکانی ئیێستا. ئەم جۆرە لە بوخچەبەهایە، بە مەترسیییەکی ڕیشەیی دەزاندریێن لەبۆ خودی ژیانی پڕۆتۆ-کوردەکان.

چونکە لەلای پڕۆتۆ-کوردەکان، ئەوان شایەنی ئەم شکۆیە نین. کە ئەسڵەن هەر بە شکۆش لە قەڵەمی نادەن.

[٩] ئەستەمبوونی ئامانجە بەعسییەکان.

[١٠] ئەنجام :-

١) قبووڵکردن تاکە چارەسەرە. دەبێتن قبووڵی بکەین کەوا؛ بەڵێ ئێمە لەناو ئەم دۆخەداین.

٢) ڕێژەی ئەگەریەتی <بەئەستەمبوون>ی "بردنەوە" و ڕاستکردنەوەی هەر گوتارێکی سەر بە ڕەوەندێکی <بەعس> لەلایەن "کوردپەروەر"/"کوردپەرست"/"کورد"ێکەوە؛ ٩٠% دەبێتن.

٣) ئێمە تەنها دەتوانین کاریگەریمان هەبێتن؛ ناتوانین هیچ تاکێک بگۆڕین.



گەر نەتزانی، بێدەنگی هەڵبژێرە.

— عەلی ئەحمەد

# بەشی حەوتەم: پرۆژەی دەنگ و ئاسۆکانی

دەروازە

وێنەکە چۆنە؟

ڕەهەندە هونەرییەکانی پرۆژەکە

ڕەهەندە سەرووسرووشتییەکانی پرۆژەکە

پرۆژەی دەنگ وەکوو بەرهەمێکی پاش-مۆدێرنیتە

خوێندنەوەیەکی ڕەخنەیی بۆ پرۆژەکە

دوا وتە

سەرچاوە و پەراوێزەکان

## دەروازە

دەنگ لە کۆنەوە ئامرازێکی بەهێز بووە بۆ هونەرمەندان بۆ دەربڕینی بیرۆکەکانیان و پێشکەشکردنی کەرەستەی دژە کولتووری. لە ڕێگەی بەکارهێنانی تەکنیک و تەکنەلۆژیای دەنگی جۆراوجۆرەوە، هونەرمەندان دەتوانن ئەزموونی نوقمکەر و بیرکردنەوە دروست بکەن کە تەحەدای نۆرمەکانی کۆمەڵگا بکەن و ئیلهامبەخش بن بۆ گۆڕانکاری.

یەکێک لەو ڕێگایانەی کە هونەرمەندان دەنگ بەکاردەهێنن بۆ دەربڕینی بیرۆکەکانیان، دەستکاریکردنی ئامێرە نەریتییەکان و دەنگییە. بۆ نموونە مۆسیقاژەنە تاقیکارییەکانی وەک جۆن کەیج و برایان ئینۆ تاقیکردنەوەیان لەسەر سیستەمی کۆکردنەوە و تەکنیکەکانی هەڕەمەکی ناتەقلیدی کردووە بۆ دروستکردنی پێکهاتەی ئاڤانگارد کە تەحەدای چاوەڕوانییەکانی گوێگر

دەکەن کە مۆسیقا دەتوانێت چی بێت. بەهەمان شێوە هونەرمەندانی هیپ هۆپ وەک "پبلیک ئێنیمی و کێندریک لامار" پێکهاتە ڕیتمیک و لیریکییەکانی مۆسیقاکەیان بۆ چارەسەرکردنی پرسەکانی نادادپەروەری کۆمەڵایەتی و ستەمکاری سیاسی کەڵکیان وەرگرتووە.

یەکێکی تر لەو ڕێگایانەی کە هونەرمەندان دەنگ بەکاردەهێنن بۆ پێشکەشکردنی مادده دژە کولتوورییەکان، بەکارهێنانی تەکنەلۆژیای ئەلیکترۆنی و دیجیتاڵییە. مۆسیقاژەنانی وەک ئەفێکس توین و ڕادیۆهێد دەنگی خراپ و شێواو و دەستکاریکردنی دیجیتاڵییان تێکەڵ کردووە بۆ دروستکردنی دیمەنی دەنگی سەرلێشێواو و دیستۆپیایی کە ڕەخنە لە زیادەڕۆییەکانی کۆمەڵگەی مۆدێرن دەگرێت. لەم نێوەندەدا هونەرمەندانی وەک بیۆرک و دافت پانک تەکنیکەکانی بەرهەمهێنانی ئەلیکترۆنییان بەکارهێناوە بۆ

دروستکردنی دیمەنی دەنگی غولامکەر و جیهانێکی تر کە دیدگای بەدیل بۆ واقیع پێشکەش دەکەن.

لە دەرەوەی مۆسیقا، هونەرمەندەکانی دەنگیش پیشەکەیان بەکارهێناوە بۆ دروستکردنی ئینستێلاسیۆن و نمایشی نوقمکەر کە تەحەدای چەمکە تەقلیدییەکانی هونەر دەکەن و بینەر لە ئاستێکی هەستیاردا سەرقاڵ دەکەن. بۆ نموونە هونەرمەندی دەنگ جانێت کاردیف ئینستێلاسیۆنی دروستکردووە کە تۆماری دەنگی دوو گوێی بەکاردەهێنێت بۆ دروستکردنی هەستکردن بە جێگۆڕکێی فەزایی و سەرلێشێواوی. هاوکات هونەرمەند تاریک ئاتۆی ئینستێلاسیۆنی دەنگی کارلێککاری دروستکردووە کە ڕێگە بە بینەران دەدات دەستکاری و شێوەی ژینگەی دەنگ بکەن، ئەمەش هێڵەکانی نێوان ئەکتەر و بینەر کاڵ دەکاتەوە.

بە گشتی بەکارهێنانی دەنگ وەک ئامرازێک بۆ دەربڕینی بیرۆکە و پێشکەشکردنی مادده دژە

کولتوورییەکان هێزێکی بەهێز بووە لە هونەری هاوچەرخدا. جا چ لە ڕێگەی تەکنیکە مۆسیقییە تەقلیدییەکانەوە بێت یان تەکنەلۆژیای دیجیتاڵی پێشکەوتوو، هونەرمەندان دەنگیان بەکارهێناوە بۆ دروستکردنی ئەزموونی نوقمکەر و بیرکردنەوە کە تەحەدای تێڕوانینەکانی گوێگر دەکەن و ئیلهامبەخشن بۆ گۆڕانکاری.



**١. وێنەکە چۆنە؟**

پێش هەموو شتێک؛ ناوی پڕۆژەکە جێگەی سەرنجە. کە پێک هاتووە لە <پڕۆژە> + <دەنگ>. <پڕۆژە> چالاکییەکی ڕێکخراوەییە. وە <دەنگ>، گەیەنەرە ... پڕۆژەی دەنگ گەیەنەری بیرۆکەیەکە بە شێوازێکی پێشاندانانە. کە لە هونەردا بە هونەری پێشاندان/گشتی ناسراوە [ فن الأداء – Performance/Exhibitionist Art].

پڕۆژەی دەنگ هەوڵ دەدات بیرۆکەکان لە ڕێگەی هونەرەوە بڵاو بکاتەوە. لۆژیکی ئەم پڕۆژەیە بەم شێوازەیە:

١. سەرەتا بیرۆکەیەک بەردەستە. (نادادپەروەریی ڕەگەزی/ Gender Inequality)

٢. بیرۆکەی پڕۆژەی دەنگ: هەڵوێستگرتنە لەسەر <دادپەروەریی ڕەگەزی> و بەرهەڵستیکردنی <نادادپەروەریی ڕەگەزی>یە.

٣. دەرهاویشتنی ئەم بیرۆکەیەی پڕۆژەی دەنگ، لەڕێگای هێڵە هونەرییەکانەوەیە. وەکوو: دەنگ.

٤.. هێڵە-هونەرییەکان ئەم بیرۆکەیە ئاڕاستە دەکەن بەرەو پانتایی <بیرۆکەکان>.

ئەم بیرۆکەیە لەناو پانتایی بیرۆکەکاندا، لە جەنگدایە لەگەڵ بیرۆکەی <نادادپەروەری ڕەگەزی>.



**٢. ڕەهەندە هونەرییەکانی پڕۆژەکە**

وێنە هونەرییەکان:

ئەم پڕۆژەیە هونەرێکە. بەڵام خودی هونەر خاوەنی کۆمەڵێک بەشە. ئەم هونەرە لەناو بەشی خستەڕووەکان و بەرجەستەبووەکاندایە. لەناو ئەو بەشەدایە کە بە پێشاندان [Exhibition] ناسراوە. لێرەدا هونەری بەرجەستەکراو خۆی دەردەخات بۆ <ڕای گشتی> و <شوێنە گشتییەکان>. ئەم دوو چەمکە، هاوپەیوەندن لەگەڵ کۆمەڵەکان و گرووپەکاندا. لێرەدا ئێمە لەگەڵ هونەرێکی گشتیدا لە پەیوەندیداین. وە هونەری گشتیش تەواو جیاوازە لە هونەری تایبەتی. هونەرێکی تایبەتی وەکوو هەبوون و بەرجەستەبوونی موڵکێکی تایبەت بە خود ڕەفتار دەکات. وەکوو: کڕینی تابلۆیەک و هەڵگرتنی. کڕینی میوزیک و هەڵگرتنی. تەنانەت بینین و بیستنی هونەر بە تاکیش (یەک-کەسی). بەڵام هونەری گشتگیر، کڕین و هەڵگرتن لەخۆ

نـــاگرێت و؛ تـــەنها لـــەناو پانتـــایی کۆمەڵایەتیـــدا خـــۆی دەردەخات.

ئەم پڕۆژەیە بیرۆکەکانی خۆی ئاراستە دەکات بۆ ئەوانـــەی کـــە دەبێت گـــوێگر بن (کـــە بریـــتین لـــە نەرمـــە دوژمنەکانی پڕۆژەکە: [پیاوسالارەکان]، [نادادپەروەرەکان]، ... ). وە ئەوانـەی کـە دەبێت دووبـارە گوێگری ببنـەوە (کـە بریـــتین لـــە دۆســـتەکانی پڕۆژەکـــە: [دادپـــەروەرەکان] [یەکسانخوازەکان] ... ).

بـــۆ ئـــەوەی ئـــەم پڕۆژەیـــە بـــوونی هـــەبێت؛ ئـــەوا دەبێت وەرگرەکانی ئـەم پڕۆژەیـەش بوونیـان هـەبێت. ئەمـە یاسـای هـــەموو هونـــەرێکی بەرجەســـتەبووە. کـــە دەبێت لـــە ئـاڵوگۆڕکردنی مامەڵـە هێماییەکانـدا [نـاردنی بیرۆکەیـەک و لێکدانی لەگەڵ بیرۆکەیەکی دیکەدا] وەرگرێک بوونی هەبێت، ئەگـەرنا نـێردراوە هونەرییەکـە هـەر لـەناو ژێرخـانی خۆیـدا دەمێنێتەوە.

<پرۆژەی دەنگ> دوو گرووپ لەیەکتری جیا دەکاتەوە. یاخود پاراوتر بڵێین؛ هەوڵ دەدات دوو گرووپ لەیەکتری جیا بکاتەوە. لێرەدا هەوڵدانێک بۆ جیاکردنەوە و پۆلێنکردنی دوو مەیدان/گرووپ دەست پێ دەکات و خۆی دەردەخات. جیاکردنەوە لێرەدا ڕووکەشێکی <دووانەیی> هەیە. لەنێوان بوون و نەبووندایە. هەوڵدانیش لێرەدا بەرجەستەکردنی خودی هونەرەکەیە. وە ئەم دوو گرووپەش کە ئاماژەمان پێ دا، دانەیەکیان بریتییە لەوانەی کە لە مانای ئەم پرۆژەیە دەگەن، گرووپەکەی دیکەش، ئەوانەن کە بەرپەچی ئەم پرۆژەیە دەدەنەوە [تاوانباران: نادادپەروەرەکان، پیاوسالارەکان] و [ئەو کەسانەی کە دژی نادادپەروەری و پیاوسالارین].

هونەری <پرۆژەی دەنگ> خۆی بەرجەستە دەکات لەناو پانتاییەکانی <چالاکی مەدەنی> و، <خەباتی

مەدەنی>. لێرەدا هونەر وەکوو ئامرازێکە بۆ جڵەوپێکردنی <بیرۆکـە ڕامیارییـەکان> لـە ئاسـتێکی نـەرمتردا. چونکـە <چالاکییە ڕامیارییە تیژەکان>؛ توانستی هونەربوونیان تێـدا نییـە و تەنانـەت هونەرمەندەکانیش نـاتوانن ئـەم کردەیـە بـە ئـەنجام بگەیـەنن و بـە شـیاوی نـازانن. وە هـەر کـاتێکیش ئەنجامی بدەن، کردەکەیەکان لە کردەی هونەربوون دەچێتـە دەرەوە و جڵـەو دەکـات بـۆ نـاو هێڵـەکانی <کـردەی ڕامیاری>.

"دۆستانی پڕۆژەکە"

| | |
|---|---|
| ١ | دادگەراکان |
| ٢ | یەکسانخوازەکان |
| ∞ | ... |

"نەرمە دوژمنەکانی پڕۆژەکە"

| | |
|---|---|
| ١ | نادادپەروەرەکان |
| ٢ | پیاوسالارەکان |
| ∞ | ... |

(هێڵکاری گرووپەکانی پڕۆژەکە)

دەنگە هونەرییەکان:

لێرەدا <دەنگ> گەیەنەری بیرۆکەکانە. لەم پرۆژەیەدا دەنگێک لە بەرزاییدایە. لێرەدا؛ ئەوە <دەنگ>ە دەسەڵاتی خۆی بەرجەستە دەکات. بەرزاییەکان ئاماژەن بۆ سەرەوە و دەسەڵات. بەتایبەتتر سەرەوەی مرۆڤ. لێرەدا مرۆڤ سەری بەرز دەکات و دەیەوێت بزانێت ئەم دەنگە لە کوێوە دێت ... پاشان تاک ئاگامەند دەبێت بەوەی کە ئەو <گوێگر>ە، وە تەنانەت بووە بە گوێگر. لێرەدا تاکێک کەوتووەتە ناو شێوەگرتنێکی گوێگرییەوە بەبێ هیچ بڕیاردانێک کە لەلایەن خۆیەوە هاتبێت. لێرەدا تاک لەناو پانتاییەکی دوو لایەنی <دەنگ> و <گوێگر>دایە. بیرۆکە هونەرییەکە لە تاکێکەوە (بێژەر/دەنگ) دەگواسترێتەوە بۆ تاکێکی دیکە (گوێگر).

<دەنگ>ە پەشۆکاوەکە ئاگادارمان دەکاتەوە لە کێشەیەک. ئەم کێشەیە ناتواندرێت بە دەنگێکی هێمنانە قسە

بکات و ویستنەکانی خۆی دەرببڕێت. چونکە لۆژیکی یارییەکە پابەندە بە شڵەژان و <کێشەی ڕەق/کێشەی ڕاستەقینە>. وە <کێشەی ڕاستەقینەی ڕەگەزی> تەنها لە ڕێگەی شڵەژانی دەنگەوە چارەسەر دەکرێت. لەبەر ئەوەی سەرەتا خودی بیرۆکەکە لەناو پانتاییەکانی ڕق و کینەوە سەری هەڵداوە و، دەبێت ئاواییش ویستی خۆی بداتەوە.



### ٣. ڕەهەندە سەرووسرووشتییەکانی پڕۆژەکە

ئایە ئەم دەنگە لە کوێوە دێت؟ ... دیارنەبوونی خودی بێژەر لێرەدا ئاماژە بۆ هێزێکی سەروومرۆیی دەکات. وەک ئەوەی دەنگێکی گەردوونی بانگهێشتمان بکات بۆ تشتێک ...

ئەم دەنگە ئاماژە بە مرۆڤێک دەکات. مرۆڤێک لە دۆخێکدا ... لێرەدا <دۆخێکی مرۆیی> سەرتاپاگیری دەکات بەسەر گشت دۆخە بەرجەستەنەبووەکانی دیکەدا. بەتایبەتتر ئەو دۆخانەی کە گوێگەر ئەزموونی نەکردووە.

لێرەدا ڕەهەندی مرۆڤگەراییانەی ئەم پڕۆژەیە ئاشکرا دەبێت و خۆی دەردەخات. خودی چەمکی <مرۆڤ> بۆ ئەم پڕۆژەیە، سەرتاپاگیرییەکە بۆ هەردوو جۆر. هەردوو ڕەگەزی <نێر> و <مێ>. لێرەدا ئەم پڕۆژەیە ئاماژە بە ڕەگەزی <مێ> دەکات. بەڵام <ڕەگەزی مێ>ی نێر و <ڕەگەزی مێ>ی مێ. ئەو ڕەگەزبینییەی کە

<مێ> هەیـــەتی بەرامبـــەر بـــە <مێ> جیـــاوازە لـــەو ڕەگەزبینییەی کە <نێر> هەیەتی بۆ <مێ>. ئەم پڕۆژەیە ئاگـاداری بـە هـەردوو ڕەگەزەکـە دەبەخشـێت. ئەمـەش مانایـەکی ناڕاسـتەوخۆ دەگەیـەنێت؛ واتاکـەی ئەوەیـە کـە هـەردوو ڕەگـەز بەشـدارن لـە <نادادپـەروەریی ڕەگـەزی> بەرامبەر بە ڕەگەزی مێ ...



### ٤. پڕۆژەی دەنگ وەکوو بەرهەمێکی پاش-مۆدێرنیتە

لە سەردەمی مۆدێرنیتەدا، گشتەکان دابەش دەبن بۆ بەش و بەشەکانیش دابەش دەبن بۆ گشت. وە دووانەکان زەقتر دەردەکەون. دووانەکان لەیەکتری دادەبڕێن. پارچەکان وزەی کێشکردنیان نامێنێت ... کێشکردن لە ڕابردووە ... لێرەدا هەردوو جۆری مرۆڤ، لێک دەکشێنەوە و <نامۆییبوونی ڕەگەزی> دێتە نێوانیان و شوێنی ئەم بۆشاییە دەگرێتەوە.

ئەم دوو ڕەگەزە لەیەکتری دابڕێندراون. <دابڕێندراوی ڕەگەزی> ... چەمکی دابڕێندراو لەگەڵ چەمکی دابڕاودا؛ جیاوازییەکی بنەڕەتییان هەیە: دابڕێندراو لەلایەن کۆمەڵێک بارگۆڕانی دەرەکی ڕوو دەدات. بەڵام چەمکی دابڕاو؛ خودی چالاکی و کردەی دابڕانە. نەوەکوو بارگۆڕانەکان ...

لە ئێستادا، هەردوو ڕەگەزەکە لەیەکتری دابڕێندراون بەهۆی کۆمەڵێک <ئامرازی ڕێکخراوەیی> و <هەڵەی خودیی تاکەکانی کۆمەڵگا> و <خۆگۆڕینە دۆڕاوەکان – Error Form>. وە تاککەرایی دژە-دەرەکی خۆی دەخزێنێتە ناو <تاکگەرایی ڕەگەزی> و، ڕەگەزەکان نامۆ دەبن لەگەڵ یەکتریدا. وە ڕەگەزەکان لە تێڕوانینی خودی ڕەگەزی خۆیانەوە لە ڕەگەزی بەرامبەر دەڕوانن و، جیهانبینینێک کە تیایدا <ئێمە هاریکاری یەکتری دەکەین و بۆ یەکتری درووست کراوین> ئەستەم دەبێت لە پێش تەمومژەکانی ڕەگەز لە سەردەمی پاش-مۆدێرنیتەدا.

پڕۆژەی دەنگ، تۆڕێکی هاوپەیوەندە بە کۆمەڵێک پرسی مۆدێرنیتە و دوای-مۆدێرنیتە. ئەو پرسانەی کە لە ئەنجامی نەمانی <مانای ژیان> و <بێماناگەرایی/هیچگەرایی> دەردەکەون. وە پڕۆژەی دەنگ هەوڵ دەدات ئەم کێشانە چارەسەر بکات.

ئەگـەرچی نادادپـەروەریی ڕەگـەزی و نادادپـەروەری و کـردەی <دژە-مێ> هـەر لـە کۆنـەوە بوونیـان هـەبووە؛ بەڵام لە ئێستادا [پردی نێوان مۆدێرنیتە و پاش-مۆدێرنیتـە] ئــەم لێکتێنەگەیشــتنە لــە هــەموو کــاتێکی دیکــەدا زەقــتر بووەتەوە. ئێستا ڕەگەزەکان دەیانەوێت بچنەوە نـاو خۆیـان. نەوەکوو لەگەڵ یەکتریدا بن.



### ٥. خوێندنەوەیەکی ڕەخنەیی بۆ پڕۆژەکە

هەروەک ئاشکرایە ئەم پڕۆژەیە بەرهەمێکی هونەرییە. وە هونەر دەکرێت بە چەندین پێوەر و ڕەهەند بەر لێشاوی ڕەخنەگرتن بکەوێت. بەڵام لێرەدا هەوڵ دەدەین ڕەخنەیەک لە خزمەتی تێگەیشتندا بنەخشێنین سەبارەت بەم پڕۆژەیە. ئەم ڕەخنەیەمان لە ئاستێکی فەلسەفی/کۆمەڵایەتی[کۆمەڵناسی]دایە. وە ئەم ڕەخنەیەمان هیچ پەیوەندی بە جۆر و شێوە و کوالێتی پڕۆژەکە و <بڕیاردانی ئێستاتیکیانە – Aesthetic Judgement> سەبارەت بە پڕۆژەکە نییە.

تێزی ڕەخنەکە بەم شێوازەیە: ئایە بەرجەستەکردنی دادپەروەری لە ڕێگای بەرهەمێکی هونەریی پێشاندەر و گشتگیر، دەتوانێت ڕێڕەوەکە بگۆڕێت و بمانگەیەنێت بە خودی دادپەروەری؟ ... لە ڕووکەشدا ئەم پرسیارە سادە بەرچاو دەکەوێت، بەڵام لە ناوەڕۆکدا خاوەنی چەندین لقی

کێشـــەئامێزە وەکـــوو: [پرســـی هونـــەر، پرســـی هونـــەری پێشاندەر، پرسی دادپەروەری].

پرســـی هونـــەر: یـــەکێک لـــەم لقانـــەی کـــە لـــە پرســـیارەکەماندا دەبێتـــەوە، بریتییـــە لـــەوەی ئـــاخۆ ئـــەرکی هونـەر چییـە؟ ... وە بەتایبـەتتر، ئـەرکی هونـەر لـە ئێسـتادا [سەدەی بیست و یـەک و ٢٠٢٣] چییـە؟ ... پـڕۆژەی دەنگ لە ڕووی هونەرییەوە دەیەوێت کۆمەڵێک ئاگادار بکاتەوە بـە کردەی شۆک و تۆقان [Shock Art]. لێرەدا ئەرکی هونەر ڕۆڵێکی ئاگادارکارییانە و ئاگـالێبوو دەگێڕێت. ئـەم پڕۆژەیـە لـــە بـــاری هونـــەردا دەیـــەوێت کۆمـــەڵگا ئاگـــادار بکاتـــەوە سەبارەت بە کێشەکە.

لقێکی دیکـە کـە لـە پرسـیارەکەمان دەبێتـەوە کـە بریتییـە لـە هونـەری پێشـاندەرانە و هونـەری ڕای گشـتی [ Exhibitionist Art/Public Art] : ئـەم جـۆرە هونـەرە، دەسـتوپەنجەی لەگـەڵ ڕای گشـتی و پانتـایی گشـتیدا نـەرم

کـردووه. وه هــەوڵ دەدات پەیوەنــدی تەنهاوتــەنها لەگــەڵ
پانتایی گشتیدا درووست بکات. له هونـەری گشـتیدا چیدیکـه
پەیوەندییــه شەخســییەکان و تاکییــەکان بوونیــان نــامێنێت.
بەڵکوو پتر سـەرنج دەبەخشـرێته سـەر ڕووکاره کۆمـەڵی و
درشـتەکان. هونـەری پێشـاندەرانه دەرکەوتەیـەکی زەقـه لـه
سەردەمی مۆدێرنیتـه و پـاش-مۆدێرنیتـەدا. ئـەم پڕۆژەیـەش
لێکەوتێکه له لێکەوتەکانی هونەری بەرجەستەبوو و جیهانی.

لقی سێیەم له پرسیارەکەماندا، پەیوەسـته بـه خـودی
دادپەروەرییــەوه. دادپــەروەری بــه هــەموو ڕەهەنــدەکانی
[یەکسـانی ڕەگـەزی، یەکسـانی لـه مـاف، یەکسـانی لـه ... ].
لێرەدا پرسەکه لەسەر ئەوەیه کـه ئـاخۆ دادپـەروەری چییـه؟
... سرووشــتی دادپــەروەری چییــه؟ ... دادپــەروەری لــه
ســەدەی بیســت و یەکــدا چییــه؟ ... ئــەم کۆمەڵــه ورده
پرســیارانه هــەموو جێگــای ســەرنجن. چونکـه بـه گشـتی،
هەتاوەکوو ئێستا پێناسەیەکی ڕەها و نەگۆڕی دادپـەروەری

دەستەبەر نەکراوە. بەتایبەتتر لە سەدەی بیست و یەکدا، ئەم پێناسەیە گرینگی پێ نەدراوە. بەڵکوو تەنها گرینگی بە ڕووکەش و دەرکەوتەکانی چەمکەکە دراوە نەوەکوو خودی چەمکەکە.

پرسی دادپەروەری و دادپەروەربوون [دادگەرایی]، دوو ئاڕاستەی سەرەکی لەخۆ دەگرێت لە سەدەی بیست و یەکدا:

ئاڕاستەی یەکەم لە باری تاکگەراییدایە. ئەم ئاڕاستەیە فیکرییە باوەڕی وایە کە دادپەروەری لە خودی تاکەوە دەست پێ دەکات. ئەوە لەسەر تاکێکە کە دادپەروەر دەبێت یاخود نەخێر. دادپەروەری چەمکێکی <چاکە>یە و پەتییە. پەیوەندی بە ڕەگەزەکانەوە نییە. بەڵکوو لە خودی تاکێکەوە دەردەکەوێت و، لە تاکێکەوە بەرەو تاکێکی دیکە دەگوازرێتەوە ... ئەم ئاڕاستەیە جەخت لەسەر تاکیەتیبوونی پرسەکە دەکاتەوە. کە باوەڕی وایە دەبێت

هەموومان سەیری خۆمان بکەینەوە و، لە ئاوێنەکەدا تەماشایەکی خۆمان بکەین بۆ هەبوونی هەر جڵەو و بۆشاییەکی ڕێگاخۆشکار بۆ دەرکەوتنی کردەی نادادپەروەرانە.

بەڵام ئاڕاستەی دووەم گرینگی بە پرسی داد دەدات لە ڕوانگەیەکی کۆمەڵگەرایانەدا. ئەم ئاڕاستەیە باوەڕی وایە کە دەبێت لە دەرەوەی تاکدا دادپەروەری بوونی هەبێت.

لێرەدا ئێمە خۆمان لەنێوان دوو ستوونی پەڕگیردا دەبینینەوە. ئاڕاستەیەکی تاکگەرایی و ئاڕاستەیەکی کۆگەراییانە. بەڵام ئەمانە پەڕگیرن و لە کۆتاییدا ئەوە دەگەڕێتەوە سەر خودی تاکێک کە ئایە پرسی دادپەروەری پەیوەستە بە چی ئاڕاستەیەکەوە. وە بگرە بابەتیترین بڕیاردان، ڕەنگە بریتی بێت لە <خاڵی ناوەند/میانڕەبوون>. میانڕەوبوونێک لەنێوان هەردوو پەڕگیرەکە و سنوورەکان پێویستە.

ئـــەم پڕۆژەیـــە کۆمـــەڵێک پرســـی هاوشـــێوە دەورووژێـــنێت هـــەروەکوو ئاماژەمـــان پێـــدا. وە خوێندنەوەیـەکی ڕەخنـەیی بـۆ پڕۆژەکـە هاوواتایـە بـە ئەنجامدانی خوێندنەوەیەکی ڕەخنەیی بۆ بەشێکی زۆری لـق و دەرهاویشـتەکانی مۆدێرنیتـە و پـاش-مۆدێرنیتـە. وە خوێندنەوەیـەک کـە لـە ئاسـتێکی >بیرکردنـەوەی ڕەخنـەیی/ Critical Thinking<دا بێت و پاشـان بچێتـەوە نـاو ئاستێکی تێگەیشتن. نەوەکوو هەر لە سەرەتاوە لە ئاسـتێکی وەسفکردن و شیکردنەوە دەست پێ بکات.



### ٦. دوا وته

پرۆژەی دەنگ بەرهەمێکی هونەرییە، کە تیایدا هەوڵ دەدات کۆمەڵێک پرسی کۆمەڵایەتی بورووژێنێت لە ڕێگەی پانتایی گشتییەوە. وە لە هەمان کاتدا، پانتایی گشتی بە ئەرێنی و بە نەرێنی بەشداری لەم پرۆژەیە دەکات. چونکە پرۆژەی گشتی، پێویستی بە پانتایی گشتییە. ئەم پرۆژەیە، بیرۆکەکانی دەچێتە چوارچێوەی کۆمەڵێک پرسی ئاکاریی و بەهازانی [Axiology]. کە تیایدا ئەم بیرۆکانە لەگەڵ کۆمەڵێک بیرۆکەی لێکدژدا هەوڵ دەدەن هەمئاهەنگی پێک بهێنن لە ڕێگەی هێڵە هونەرییەکانەوە.






وێنەیەک لە کاتی پەخشکردنی پڕۆژەکە ...

گوێچکەکان بیستیان و چاوەکانیش بینیان.

— عەلی ئەحمەد

# بەشی هەشتەم: زانستی پێناسەکاری

؛١؛ زانستی پێناسەکاری، ئەو زانستەیە، کە لێکۆڵینەوە[یەکی ورد] دەکات لەسەر [چۆنیەتی] پێناسەکردن و پێناسەکانی وشەکان [چەمکەکان] بەگشتی. ئەم زانستە دەست دەکات بە دووبارە هەڵسەنگاندنەوە و، شیکردنەوە [و ...] دەکات لەبۆ ماناکان و پێناسەکانی وشەکان [چەمکەکان]. ئەم زانستە [پێویستە] بە گرینگ تەماشا [بکرێت] دەکرێت لەبەر ئەوەی بە هۆی نەبوونی ئەم زانستە (بەکار نەهێنانی و هەست پێ نەکردنی، ئەکتوالیزەنەکردنی)، لە هەندێک جاردا مشتومڕی زانستی درووست دەبێت تەنها لەسەر ڕێک نەکەوتنێک لەسەر پێناسەیەکی وشەیەک [چەمکێک] لە بابەتێک لە مشتومڕەکە، کە وا دەکات مشتومڕەکە نەگات بە هیچ دەرکەوتەیەک و ئەمەش وا دەکات ئامادەبوونی < زانستی پێناسەکاری > لەم بارودۆخانەدا بە گرینگ

بزاندرێت و ببێت بە کەرەستەیەکی بەسوود لەبۆ هەموو بوارە زانستییەکان بەگشتی.

---

؛٢؛ < زانستی پێناسەکاری > لێکۆڵینەوە دەکات لەبۆ گەیشتن بە تێگەیشتنێکی ڕوون[تر] لە بەرامبەر پێناسەکانی وشەکان [چەمکەکان]، چونکە پێناسەی وشەکان [چەمکەکان] گرینگن لەبەر ئەوەی کاتێک کە بەکار دەهێندرێن لە چەندین بواری زانستیدا، بە نەگونجاو بەکار هێنانی وشەیەک [چەمکێک]، کێشە درووست دەکات (کێشەیەک وەک: نەگەیشتن بە هیچ دەرئەنجام و لێکەوتەیەک[ی پوخت و بەسوود]).

---

؛٣؛ ئەگەر پێناسەکان دووبارە هەڵسەنگاندنیان لەبۆ بکردرێتەوە، ئەوە دەبینین کە زۆرانێک لە بەهەڵەتێگەیشتنەکانمان لەبۆ ڕوون دەکاتەوە لەسەر

تێڕوانینمـان بەرامبـەر بـە وشـەکان [چەمکـەکان]، وە ئەگـەر ئەم بەهەڵەتێگەیشتنانەمان لەبۆ ڕوون ببێتەوە، ئەوە دەبینین کە بەرچاوڕوونییەکی باشترمان لەبۆ دێتە دی لـە مشـتومڕە زانستییەکاندا.

---

؛٤؛ ئـەم زانسـتە بـە گرینـگ دادەنـدرێت [وە پێویستیشـە بـە گرینـگ دابنـدرێت] چونکـە زۆر جـار ئێمـە دەبیـنین کـەوا وشەیەک [چەمکێک] لەبۆ چەندین مەبەست و پێناسـە بـەکار دەهێنـدرێت و پێناسـەیەکی سـەرەکی نییـە (یـاخود کۆمـەڵێک پێناسەی هەیە کە ئاگاداریان نین)، لەبۆنموونە کاتێک دەڵێین چەمکی < درووستبوون > چییە و پێناسەکەی چییە؟، ئـەوە دەبیـنین کـە چەنـدین پێناسـەی لێ دەبێتـەوە و لـەم چەنـدین پێناسـانەش هـەموویان دەشـێت بشـێن لـەبۆ پێناسـەکردنی چەمکەکـە. < زانسـتی پێناسـەکاری > بـە تـەنها کـار لەسـەر ئـەوە ناکـات کـە کـام پێناسـە ڕەوان تـرە لـە پێناسـەکانی تـر

لەبۆ وشەیەک [چەمکێک]، بەڵکوو کار لەسەر ئەوەش دەکات کە ئایە ئەم وشەیە [چەمکە] چەند پێناسەی تریش لەبۆی دەگونجێن و ڕێک دەکەون لەگەڵیدا (چەند پێناسەی تری هەیە کە ئاگاداری نین).

---

؛٥؛ مەبەست و ئامانجی سەرەکی لە < زانستی پێناسەکاری >دا، ئەوەیە کە ئایە ئێمە لەبۆچی لەسەر یەک پێناسەی وشەیەک [چەمکێک] ناکۆکین و ئایە کام جۆر لە پێناسە گونجاوە لەبۆ ئەو وشەیە [چەمکە]. یاخود ئایە ئەم وشەیە [چەمکە] بێجگە لە یەک پێناسە، کۆمەڵێک پێناسەی تری هەیە یاخود نا؟. ئەم بەهەڵەتێگەیشتنانە زۆر جار بەدی دەکرێت لە [زانستی] فەلسەفەدا، کە کێشە دەکەوێتە سەر ئەوەی کە ئایە کام پێناسە گونجاوە لەبۆ چەمکێک کە لەبەر دەستماندایە. هەتاوەکوو ئێستاش ئەم چەمکانە بە بەردەوامی دەکەونە جێگەی قسەلەسەرکردن لە بازنە

فەلسەفییەکاندا، چەمکانێک وەکوو: < بوون >، < دروستبوون >، < خودا >، < چاکە > < خراپە > ... لە ڕاستیدا کێشەکە ئەوە نییە کە ئایە کامە پێناسەی کامیان [فەیلەسووفەکان] ڕاستترە و ڕەوانترە، بەڵکوو کێشەکە ئەوەیە کە ئەم چەمکانە هەر یەکێکیان خاوەنی نەک تەنها یەک پێناسە نین، بەڵکوو لقیان زۆرە و ئەگەری هەیە خاوەنی زیاتر لە دوو، سێ، هەزار، بێکۆتا، پێناسە بن. لەبۆنموونە کاتێک دەپرسین کە پێناسەی < دروستبوون > چییە؟، پێناسەیەک دەڵێت: دروستبوون واتا شتێک لە هیچەوە بێتە بوون، پێناسەیەک دەڵێت: دروستبوون واتا شتێک بە شتێکی تر دەلکێندرێت و شتێکی نوێ درووست دەبێت، هەر وەک دیارە، کە ئێمە دەتوانین چەندین پێناسە بدۆزینەوە لەبۆ تەنها یەک چەمک کە هەر هەموو پێناسەکانیش جێگەی ڕەوان.

---

؛٦؛ بـه هـۆی ئـەکتوالیزەکردن و ئاگـاداربوون لـە هــەبوونی چەندین پێناسەی چەمکێک، ئـەوە ئێمـە دەتـوانین ئاسـانتر لـە حاڵەتەکان بڕوانین.

–

مێتازانســتی پێناســەکاری، ئــەو زانســتەیە، کــە لــە ئــامراز و کەرستەکانی زانستی پێناسەکاری دەکۆڵێتەوە.

---

**درووستبوون چییە؟**

١

درووستبوون وەک هاتنەبوون.

نموونە: (شتێک کە لە هیچەوە، بێتە بوون)

نموونە: ( هیچ => شت)

نموونە: (_ => ش)

٢

درووستبوون وەک پێکهاتن

نموونـــــه: (شـــــتێک بـــــه شـــــتێک دەلکێت و پێـــــک دێت، دەرئەنجامەکە درووستبوونە)

نموونە: (۱+۱ => ۲)

نموونە: (ش + ش => ش ش)

۳

درووستبوون وەک لێکبوونەوە

نموونـە: ( شـتێک لـە شـتێک لێـک دەبێتـەوە، دەرئەنجامەکـە درووستبوونە)

نموونە: ( ۱-۱ => ۰)

نموونە: ش - ش => _)

٤

درووستبوون وەک گۆڕان

نموونـە: (شـتێک دەگـۆڕێت بـۆ شـتێکی تـر، دەرئەنجامەکـە درووستبوونە)

نموونە: (٤ => ٩)

نموونه: (ش=> ش)

---



بەشێکی زۆری زانستەکان لەسەر بنەماگەلێکی لاواز دامەزراون کە لەدوای هەر دۆزینەوەیەک بنەماکان تووشی لەرزان دەبن و لە دوا قۆناغیشدا بە شێوازێکی سرووشتی خودی زانستەکەش لاواز دەبێت ... = نەمان!

— عەلی ئەحمەد

# بەشی نۆیەم: بنچینە بابەتییەکان

١) <فاکت>:

<فاکت>(ناو): لە <Fact>ی زمانی ئینگلیزیدا هاتووە. کە ڕیشەکەی دەچێتەوە سەر زمانی لاتینی. کە لە <Factum> هاتووە. لە زمانی لاتینیدا، <Factum> هاوواتایە بە :- ڕوودانێک، پێشهاتێک، دەستکەوتێک.

لە سەدە نێوەندەکانی زمانی لاتینیدا هەروەها بە مانای :- دۆخ، ڕەوش، هەلومەرج، هاتووە.

لە ئێستادا، چەمکی <فاکت>، بریتییە لە :- ئەوەی کەوا ڕاستە. ئەوەی کەوا هەیە. ئەوەی کەوا لە ڕووداندایە یاخود ڕووی داوە.

---

٢) <لێکدانەوە> : <لێکدانەوە>(ناو): لە زمانی کوردیدا، خودی وشەکە بە واتای <لێکدان> بریتییە لە <لەیەکدان>.

بەڵام لێرەدا ئێمە چەمکی <لێکدانەوە>مان بەکار هێناوە لەگەڵ هاووتاییبوون بە چەمکی < interpretari>ی زمانی لاتینی و، < التفسیر> زمانی عەرەبی.

<لێکدانەوە> بریتییە لە <وەها دانان>ی پرسێک/دەستەواژەیەک. لەبۆوێنە :-

١) لێکدانەوەی ئەوان سەبارەت بە مانگگیران هەڵەیە.

٢) لێکدانەوەی من لەبۆ پرسەکانی ئەمڕۆ ڕاست نەبوون.

٣) لێکدانەوەکانی تۆ لەبۆ پرسەکان ڕاست دەرچوون.

کەواتا :- <لێکدانەوە> = <وەها دانان>.

٣) <بەلێکدانەوەکردن>:

<بەلێکدانەوەکردن>(کار): پرۆسێسێکە کەوا تیایدا <فاکت>ەکان لێکدانەوەیان لەبۆ دەکرێت. لەسەر هەر جۆرێک لە بنەما و بناغە بێت. لە پرۆسێسی <بەلێکدانەوەکردن>دا، گرینگ نییە <لێکدانەوە>کە

چۆناوچۆنـە/چییـە. بـەڵکوو ئـەوەی گرینگـە، تـەنها بریتییـە لەوەی کەوا :- خودی <فاکت>-ێک دەکرێت و دەچێت لـەبۆ نـاو پرۆسێسـی <بەلێکدانـەوەکردن>. لـە دواجـاردا خـودی پرۆسێسەکە بریتییە لە :- <بەلێکدانەوەکردنی فاکتێک>.

٤) <تیۆری-سێتەکان>:

<تیـۆری-سـێتەکان>(نـاو): کورتەمێژوویـەک و ڕیشـەی ئیتیمۆلۆژی باس بکە؟

لـەم توێژینەوەیـەدا، ئێمـە تـەنها کـەڵک لـە هەنـدێک لـە ئامڕازەکانی <تیۆری-سێتەکان> وەردەگرین. ئامڕازگـەلێکی وەکوو:-

١) خــودی ســێت وەکــوو خڕکردنەوەیــەک و ڕێکخستنکارێک :- { }

٢) پێویستییەتی ئەندامبوون لەنێو سێتدا :-

٣) پێویســتییەتی ئەنــدامبوون-بــە-ســێت :- دەبێت نــاوی سێتەکە هاوپەیوەند ببێت لەگەڵ ئەندامەکانی نێو سێتەکە.

---

٥) <بەسێتکردن>:

<بەســێتکردن>(کــار): پرۆسێســێکە کــە تیایــدا کۆمــەڵێک <کۆتــاک، شــمەک...> خــڕ دەکــرێن لــەبۆ نێــو یــەک ســێت.

لەبۆوێنە:-

١) سێتی هەموو ڕاستییەکان :- {ڕ}:- {ڕاستییەکان}

٢) سێتی هەموو فاکتەکان :- {فـ} :- {فاکتەکان}

٣) سێتی هەموو لێکدانەوەکان :- {لـ} :- {لێکدانەوەکان}

بــە پێچەوانــەی پرۆسێســی <بەلێکدانــەوەکردن>، پرۆسێســی <بەســێتکردن> دەبێت هــەموو ئەندامــەکانی کــۆک/هــاوکۆک ببن لەگەڵ خودی ئەو سێتەی کە تێیدان. [واتــا نــابێت ســێتی هــەموو ژمــارە جووتــەکان، ژمــارەی تــاکی تێدا بێت...] لــەنێو

پڕۆسێسی >بەسێتکردن<دا، گرینگ نییە چی شمەکگەلێک دەکەیت بە سێت. بەڵکوو ئەوە پێویستە کەوا هەموو شمەکەکان لەگەڵ ئەو سێتەدا لەنێو پڕۆسێسێکی هاوپەیوەندیدا ببن.

٦) >بابەتەڕێژە<:

>بابەتەڕێژە<(ناو): بریتییە لەو ئەنجامەی کەوا لە پڕۆسێسی گەڕان و لێکۆڵینەوە لە >بناغەیەکی بابەتی< بەدەست دەکەوێت. واتا ئامادەبوونێک و هەوڵێک لە >ڕێژەگەرایی<ەوە لەبۆ >بابەتگەرایی<.

٧) >سێتی گەردوون<:

>سێتی گەردوون<(ناو): پێک هاتووە لە ئەو سێتەی کەوا هەموو گەردوونی تێدا خڕ بووە. بە شێوەیەکی ڕێکوپێکتر بیڵێم :- ئەو سێتەیە کەوا هەموو گەردوونی تێدایە. [هەڵبەتە بێجگە لە >دەرەوەی گەردوون<.]

<سێتی گەردوون> بە نووسینی سیمبوولی، بەم شێوازە دەبێت :- {گ} / {U}

٨) <فاکتی دژە-فاکت>:

<فاکتی دژە-فاکت>(ناو): ئەم جۆرە فاکتەیە کەوا لێکدژە لەگەڵ خۆیدا. خۆی وەکوو <فاکت> دەردەخات. وە لە هەمان کاتیشدا پێچەوانەی <فاکت>ـە. <فاکتی دژە-فاکت> بریتییە لە <لێکدانەوە> بەڵام لە بەرگری <فاکتی دژە ٠فاکت>دا. کەواتا :- <فاکتی دژە٠فاکت> = یەکێک لە <لێکدانەوەکان>.

٩) <لێکدانەوەی بەفاکت-زاندراو>:

<لێکدانەوەی بەفاکت-زاندراو>(ناو): هەموو ئەو <لێکدانەوە>انەن کەوا خۆیان وەکوو <فاکت> دەردەخەن. بەڵام هەر وەکوو <فاکتی دژە-فاکت> وان. کە لە ڕاستیدا بریتین لە تەنها <لێکدانەوە>. نەوەکوو <فاکت>. چەمکی

<زاندراو> لێرەدا گرینگە ئاماژەی پێ بکەین. چونکە وەها زاندراوە. نەوەکوو وەکوو ئەوەی کە هەبێت.

١٠) <لێکدانەوەی دژە-لێکدانەوە>:

<لێکدانەوەی دژە-لێکدانەوە>(ناو): ئەو دۆخەیە کەوا کاتێک لێکدانەوەیەک لەبۆ <بناغەیەکی بابەتی> دەکەیت، بە پێشمەرجی هەبوونی <بناغەیەکی ڕێژەگەرایی>انە.

لەبۆوێنە :-

١) هیچ ڕاستییەک بوونی نییە = <بناغەیەکی ڕێژەگەرایی>.

٢) ئەم دەستەواژەی سەرەوە ڕاستە = <بناغەیەکی بابەتی>.

٣) <بناغەیەکی بابەتی> نەگونجاوە لەگەڵ <بناغەیەکی ڕێژەگەرایی>.

٤) کەواتا :- <لێکدانەوەیەکی دژە-لێکدانەوە> هاتە ئەنجام.

هــەموو <لێکدانەوەیــەکی-ڕێژەگــەرایی>، ئەنجامەکــەی بــە خۆڕســکانە بریتییــە لــە <لێکدانەوەیــەکی دژە-لێکدانــەوە>. چونکــە بــە خۆڕســکانە لــە <ڕێژەییبــوون> دەگــۆڕێت لــەبۆ <بابەتیبوون>.

١١) <یەکفاکت>:

<یەکفاکت>(ناو): دەستەواژەکەی <فرێدرێک ویلێام نیتچــە> ئەنجامەکەی بریتییە لە هەبوونی تــەنها <یــەکفاکت> :- یــەک فاکت، لەنێو {سێتی گەردوون}دا.

١) لەبەرچی هــەڵبژاردنی <فرێــدرێک ویلێــام نیتچــە> وەکوو نموونەیەکی <ڕێگاخۆشکردنی ڕەوتی ڕێژەگەرایی>؟

زۆرێک لە خوێندەوارانی بابەتی فەلســەفی، وە بەتایبــەتتر بــە ڕێژەیــەکی بــەرچاو لــە خوێنــدەوارانی فەیلەســووفی ئــەڵمانی <فرێــدرێک ویلێــام نیتچــە>، باوەڕیــان وایــە [یــاخود وەهــا تێگەیشــتوون] کــەوا ئــەم فەیلەســووفە ســەر بــە هەنــدێک بنــەمای ڕێژەگەراییــە. یــاخود بــە شــێوەیەکی گشــتیتر بڵــێین،

<فرێدرێک ویلیام نیتچە> سەر بە ڕێبازی ڕێژەگەراییە. وە یەکێک بووە لە دەستپێشخەرە سەرەکییەکانی ڕێبازی ڕێژەگەرایی لەنێو پانتایی زانستی ئیپیستیمۆلۆژیادا. وە هەروەها یەکانگیرییەکی زۆر هەیە لەنێو خوێندەوارانی <فرێدرێک ویلیام نیتچە>دا کە لەبەر ئەوەی ئەم فەیلەسووفە <نایەلیست>ە. کەواتا ئەم فەیلەسووفە باوەڕی بە هیچ <بنەمایەکی بابەتی> نییە. یاخود باوەڕی بە هیچ ڕاستییەک نییە. هیچ حەقیقەتێک بوونی نییە.

١.١) لەبەرچی دەبێت <ڕێژەگەرایی فرێدرێک ویلیام نیتچە> ڕەت بکردرێت :-

لە ئەم توێژینەوەیەدا، پرۆسێسی سەرەکی، هەر نەک تەنها بریتی نییە لە ڕەتکردنەوەی <ڕێژەگەرایی فرێدرێک ویلیام نیتچە>، بەڵکوو بریتیشە لە دەرخستنی ئەو لێکدژییەی کە لەنێو <ڕێژەگەرایی فرێدرێک ویلیام نیتچە>دا هەیە، کە لە

دواجاردا دەمانگەیەنێت بە <بنەمایەکی بابەتی>. یاخود بناغەیەکی بابەتی.

---

١) ڕەچەڵەکی دەستەواژەکەی <فریدریک ویلیام نیتچە> :-

<فریدریک ویلیام نیتچە/Friedrich Wilhelm Nietzsche> لە پەڕتووکی <ویستی هێز>دا، دەئاخڤێت:-

هیچ فاکتێک بوونی نییە، تەنها لێکدانەوەکان نەبێت.

خودی نووسینەکە بەم شێوازەیە:-

"No, facts is precisely what there is not, only interpretations"

ئەگەر ئێمە وەرگێڕانی وشەبەوشە لەبۆ ئەم دەستەواژەیە بکەین، ئەوا بەم شێوەیە دەبێت:-

نەخێر، فاکتەکان ئەوە نین کە هەن، تەنها لێکدانەوەکان.

سەرچاوە:-

Friedrich Nietzsche, The Will to Power,] translated by Walter Kaufmann and R. J. [Hollingdale § 481

لێرەدا <فرێدرێک ویلّیام نیتچە> پرسێکی بنەڕەتی دەردەخات. (هەڵبەتە بە پێی <پسپۆڕانی فرێدرێک ویلّیام نیتچە> ئەم پەڕتووکە ئەگەریەتێکی زۆری تێدا هەیە کەوا دەستکاری کردرابێت لەلایەن خوشکەکەیەوە/Elisabeth Förster-Nietzsche – وە هەروەها ئەستەمیەتێکی زۆر لەم دەستەواژەدا هەیە کەوا لەلایەن خودی نووسەرەوە چا کرابێت. چونکە <فرێدرێک ویلّیام نیتچە> خۆی "باوەڕ"ی بە کۆمەڵێک بەهاگەل هەبوو.).

٢) دەستەواژەکە :-

سەرەتا، با بزانین ئەم دەستەواژەیە چی ئاڵنگارییەکی تێدا هەیە و لێکەوتەکانی چین:-

[هــەر وەکــوو ڕوونــە،] ئــەم دەســتەواژەیە لــە دوو بەشــی سەرەکی  پێک هاتووە :-

---

بەشی یەکەم:-

١) هیچ فاکتێک بوونی نییە.

هاوواتا:- ١.١) فاکت بوونی نییە.

هاوواتا:- ١.٢) <سیێتی گەردوون> فاکتی تێدا نییە.

-

بەشی دووەم:-

٢) لێکدانەوەکان بوونیان هەیە.

هاوواتا:- ٢.١) لێکدانەوە بوونی هەیە.

هاوواتا:- ٢.٢) <سیێتی گەردوون> تەنها لێکدانەوەیە.

-

سادەکردن:-

فاکت بوونی نییە، لێکدانەوە بوونی هەیە.

---

کەواتا :- فاکت بوونی نییە، لێکدانەوە بوونی هەیە.

بە سیمبوولی-لۆژیکی:-

{فـ} = . / {لـ} = [ئەگەریەتی] بێسنوور[بوون]

---

هاوواتاکانی دەستەواژەکە:-

١) هەموو فاکتەکان لێکدانەوەن:-

{فـ} = {لـ}

{لـ} = {فـ}

١.١) فاکتە بیریارییەکان هەمووی لەنێو مێشکمانن.

١.٢) فاکتەکان لەبۆیە هەن، چونکە ئێمە هەین.

١.٣) >بەلێکدانەوەکردن<ی تەواوی بناغە/بنەما ماتماتیکییەکان.

---

٢) هیچ فاکتێک بوونی نییە:-

٢.١) خودی (فـ) = نا(فـ)

٢.٢) سێتی {فـ} = ناف / سێتی {ف} = ٠

٢.٣) هیچ فاکتێک بوونی نییە هەتاوەکوو لەبۆی بگەڕێینەوە.

٢.٤) >بەلێکدانەوەکردن<ی تەواوی بنەما/بناغە ماتماتیکییەکان.

---

٣) لێکدانەوەکان بوونیان هەیە:-

سێتی {لـ} = (لـ١) – (لـ٢) – (لـ٣)...

٣.١) هەموو فاکتەکان تەنها لێکدانەوەیەکن و ڕێژەیین.

٣.٢) فاکتەکان ڕەها نین.

٣.٣) <بەلێکدانەوەکردن>ی تەواوی بنەما/بناغە ماتماتیکییەکان.

---

٤) تەنها یەک فاکت بوونی هەیە:-

{فـ} = {لـ}

٤.١) فاکتەکان تەنها وێنەدانەوەی لێکدانەوەکانمانن.

٤.٢) <بەلێکدانەوەکردن>ی تەواوی بنەما/بناغە ماتماتیکییەکان.

---

لێکدژییەکانی دەستەواژەکە:-

١) ئایە چلۆن سێتی فاکتەکان، هیچ فاکتێکی تێدا نییە؟

{فـ} = نافـ [یاخود] ٠

٢) ئایە چلۆن سێتی فاکتەکان، بریتییە لە لێکدانەوەکان؟

{فـ} = (لـ)

٣) ئایە لێکدانەوەکان بریتین لە فاکت؟

{لـ} = {فـ}

سێتی لێکدانەوەکان، ئەندامەکانیان بریتین لە فاکتەکان.

بەڵام خودی سێتەکە، سێتی لێکدانەوەکانە. (لێکدژی).

{تەنها یەک فاکت بوونی هەیە}

نەبوونی فاکت هاوواتایە بە نەبوونی تەنانەت هیچ جۆرێک لە ڕاستی. چونکە یەکێک لە ئەندامەکانی سێتی ڕاستی، بریتییە لە فاکت. هەڵبەتە هەرایەکی زۆر هەیە لەنێو پانتایی

<گوتـار-و-دەربـڕین>ــە فەلسـەفییەکان سـەبارەت بـەوەی کەوا <نەبوونی-فاکت> بریتییـە تـەنها لـە ڕێگەخۆشـکردن و هاوپەیوەستبوون بە بنـەما <ڕێژەگەراییـەکان>. سـەرەتا بـا بزانین سێتی ڕاستییەکان لە چی پێک هاتووە :-

{ڕ} :- فاکتەکان، ژمارەکان، لۆژیک،...

[لـە ڕاسـتیدا فـاکت، وە هـەموو شـمەکەکانی نێـو سـێتی {ڕ}، بریتین لە هەموو ئـەو شـمەکانەی کـەوا لـە دەرەوەی ئێمـەدا بـوونێکی سـەربەخۆیان هەیـە. هەڵبەتـە سـەربەخۆیی لـێرەدا چەمکێکی گشتگیرە. بەڵام ئەگـەر بـە چڕتـر بئاخڤین: هـەموو شــمەکەکانی نێــو ســێتی {ڕ}، لــە دەرەوەی <مــرۆڤ>دا بوونیان هەیە و پەیوەندی بـە هـەبوون و نـەبوونی بینـەرێک و مرۆڤێک نییە هەتاوەکوو پەی بە بوونەکەی ببردرێت.]

بەڵام وادابنێین لە گەردووندا تەنها یەک فـاکت بـوونی هەیـە، ئـەویش ئەوەیـە کـەوا هیچ فاکتێـک بـوونی نییـە. ئەگـەر بـەم دەسـتەواژەیە بێت. کـەواتا تـەنها یـەک فـاکت بـوونی هەیـە.

چونکە خودی ئەم دەستەواژەیە <بەفاکتبوون>ی <هیچ فاکتێک بوونی نییە> دەچەسپێنێت.

لە سێتی {فاکت}دا، ئەم شمەکانەی خوارەوە ئەندامن:–

١. ڕاستی نەگۆڕ (بنەما بیرکارییەکان).

١.١ ڕاستی نەگۆڕ (ڕوویداو) و (ڕوودان).

–

٢. ڕاستی گۆڕاو (بنەما بایۆلۆژییەکان).

ئەم دەستەواژەیەی <فڕیدڕیک ویلّیام نیتچە> خۆی بریتییە لە فاکتێک. لەبەر ئەوەی <لێکدانەوەکان> دەکات بە پێشمەرجی هەموو فاکتێک. کەواتا: تاکە فاکت لەنێو ئەم گەردوونەدا ئامادەیی هەبێت، بریتییە لە :– هیچ فاکتێک بوونی نییە، تەنها لێکدانەوە نەبێت. وادابنێ کەوا ئەم دەستەواژەیە ڕاستە  و، تەنها یەک فاکت لە گەردووندا بوونی هەیە. کە بریتییە لەوەی کە هیچ فاکتێک بوونی نییە.

{لێکدژی دەستەواژەی <تەنها یەک فاکت بوونی هەیە، ئەویش ئەوەیە کە هیچ فاکتێک بوونی نییە>}

سەرەکیترین نووقوورچەکان دژ بە ڕێژەگەرایی-ڕەها:-

١) ئەگەر هەموو شتێک ڕێژەیی بێت، کەواتا <ڕێژەگەراکان> ناتوانن بڵێن <ڕێژەگەرایی> ئاوەزمەندتر و تەواوترە لەسەر هەر جۆرێک لە جیهانبینینێکی تر.

٢) قبوولکردنی جیهانبینینی <ڕێژەگەرایی> پەیوەستە بە هەبوونی پێشمەرجێکی بابەتیانە. چونکە قبوولکردن پەیوەستە بە ڕاستزانینی پرسێک. وە بەڕاستزانینی پرسێک بریتییە لە بە بابەتیبوون و بەبابەتیبینینی خودی پرسەکە. کەواتا <ڕێژەگەرا> نیت.

٣) گوتاری <ڕێژەگەراکان> سەبارەت بە <ڕاستیبوون>ی پرسەکانیان تەنهاوتەنها لەنێو چوارچێوەیەکدا(فرەیموۆرک)، وە هەبوونی <ڕاستی> لەنێو چوارچێوەکەی بەرامبەریان. ئەمە ئەوە دەردەخات کەوا هیچ لایەک ڕاست نییە. چونکە

هـــەردووکیان ڕێـــژەیین. کـــەواتا: لەبـــەرچی هۆکارێـــک بیروبـاوەڕی چوارچێـوەی گـرووپی (بـ) ڕاسـتە و لەبـەرچی هۆکارێک بیروباوەڕی گرووپی (پـ) ڕاست نییە؟...

٣.١) نارەزایەتی و نـاکۆکی لـەنێو چوارچێوەیەکدا دەبێت بـە هۆکـاری <مشـتومڕی-بێسـنوور>. کـە هـەرگیز ناگـات بـە <ڕاســـتییەکی بابـــەتی>. ئەگەریـــەتی نزیکبوونـــەوە لـــە <ڕاستییەکی بابەتی> تێدا هەیە. بەڵام گەیشتن نەخێر.

٣.٢) نارەزایـــەتی و نـــاکۆکی لـــەنێوان دوو چوارچێـــوەدا سـەلمێندراوە کـەوا چارەسـەر نـەکرێت. چونکـە هـەردوو چوارچێوەکە لەسەر بناغەیەکی ڕێژەگەرایی بوونیاد کراون.

٤) ڕێژەگەراکان دەئاخڤن :-

١) هەموو ڕاستییەک ڕێژەییە.

ئەم دەستەواژەیە یان ڕێژەییە، یاخود ڕەهایە.

١.١) ئەگەر ڕەهایە، کەواتا ئەم دەستەواژەیە هەڵەیە. چونکە <هەموو ڕاستییەک ڕێژەیی نییە>.

١.٢) ئەگەر ڕێژەییە، کەواتا دەبێت ڕاستییەکی تر هەبێت کەوا ڕەهایە. ئەگەرنا ئەوە ڕەها دەبوو کە <هەموو ڕاستییەک ڕێژەیی>ە.

٢) کەواتا :- ڕێژەگەرایی، خودڕەتکارە(سێڵف-ڕیفیووتینگ).

---

لە سێتی یەکەمدا، ئێمە یەک فاکتمان هەیە، ئەویش ئەوەیە

کە هەموو شتێک پەیوەندی بە

ئینتەرپریتەیت هەیە و هیچ فاکتێک بوونی نییە

لە سێتی دووەمدا، ئێمە فاکتەکانمان بێسنوورن، چونکە ئینتەرپریتەکان هەر یەکەکیان فاکتێکی سەربەخۆن، لەبەرئەوە فاکتەکان بێسنوورن

لە سێتی سێیەمدا، ئەگەر فاکتەکان بێسنوور بن، ئەوە هاوواتا نییە کەوا ئینتەرپریتەکانیش بێسنوورن. کەواتا فاکتەکان بێسنوورن و ئینتەرپریتەکانیش هیچ

لە سێتی یەکەمدا، ئێمە یەک فاکتمان هەیە، ئەویش ئەوەیە کە هەموو شتێک پەیوەندی بە

ئینتەرپریتەیت هەیە و هیچ فاکتێک بوونی نییە

لە سێتی دووەمدا، ئێمە فاکتەکانمان بێسنوورن، چونکە ئینتەرپریتەکان هەر یەکەکیان فاکتێکی سەربەخۆن، لەبەرئەوە فاکتەکان بێسنوورن

لە سێتی سێیەمدا، ئەگەر فاکتەکان بێسنوور بن، ئەوە هاوواتا نییە کەوا ئینتەرپریتەکانیش بێسنوورن. کەواتا فاکتەکان بێسنوورن و ئینتەرپریتەکانیش هیچ

---

(ئەم هێڵکارییە تەواوی دۆخەکە شی دەکاتەوە)

$$\begin{matrix} F = 0 \\ I = \infty \\ - \end{matrix}$$

$$\begin{bmatrix} F = 1 \\ F = 0, I = \infty \\ \{1\} \end{bmatrix} - \begin{bmatrix} F = \infty \\ I = \infty = F = \infty \\ \{2\} \end{bmatrix} - \begin{bmatrix} F = \infty \neq I = \infty \\ \therefore F = \infty \therefore I = 0 \\ \{3\} \end{bmatrix}$$

---

## دوو ئارگیومێنت بەرانبەر بە ڕێلەتیڤیزم

هەموو فاکتەکان ڕێلەتیڤن.

(Absolute)ئەم دەستەواژەیە یان ڕێلەتیڤە یانیش فاکتێکی تەواوەتییە.

ئەگەر فاکتێکی تەواوەتییە ئەوە هەڵەیە چونکە ١)هیچ شتێک فاکتێکی تەواوەتی نییە و هەموو .شتێک ڕێلەتیڤە بە گوێرەی ئەم دەستەواژەیە(٢ ئەگەر ئەم دەستەواژەیە فاکتێکی تەواوەتییە ئەوە کەواتا ڕێلەتیڤیزم بوونی نییە، چونکە ئەم فاکتەمان هەیە.

ئەگەر ڕێلەتیڤە ئەوە کەواتا فاکتێکی تر هەیە لە دەرەوەی ئەم دەستەواژەیە.

---

دوو ئارگیومێنت بەرانبەر بە ڕێلەتیڤیزم لەسەر دەستەواژەیەکی ڕێلەتیڤیستی:

١] ئەگەر هەموو شتێک ڕێلەتیڤ بێت، ئەوە ڕێلەتیڤیستەکان ناتوانن بڵێن ڕێلەتیڤیزم ڕوانینێکی پەسەندترە لە ڕوانینەکانی تر. چونکە ئەگەر وەها بڵێن، ئەوە واتا بابەتییانەن.

٢]دەستەواژەی {هەموو ڕاستییەکان ڕێلەتیڤن}

ئەم دەستەواژەیە یان ڕێلەتیڤە یانیش ڕاستییەکی ڕەهایە.

ئەگەر ڕاستییەکی ڕەهایە، ئەوە ئەم دەستەواژەیە هەڵەیە، چونکە:

١] هیچ شتێک ڕاستییەکی ڕەها بوونی نییە و هەموو شـتێک ڕێلەتیڤە بە گوێرەی ئەم دەستەواژەیە.

٢] ئەگەر ئەم دەستەواژەیە ڕێلەتیڤە، ئەوە دەبێت ڕاستی تـر هەبێت کە ڕەهایـە و ئەگـەرنا ئـەوە دەبـوو ڕاسـتییەکی ڕەهـا دەبێت کە هەموو شتێک ڕێلەتیڤە.

**دوو ئارگیومێنت بەرانبەر بە ڕێلەتیڤیزم**

هەموو فاکتەکان ڕێلەتیڤن

(Absolute)ئەم دەستەواژەیە یان ڕێلەتیڤـە یـانیش فـاکتێکی ڕەها

ئەگـەر فـاکتێکی ڕەهایـە ئـەوە هەڵەیـە چونکـە (١)هیچ شـتێک فــاکتێکی تــەواوەتی نییــە و هــەموو .شــتێک ڕێلەتیڤــە بــە گــوێرەی ئــەم دەســتەواژەیە(٢)ئەگــەر ئــەم دەســتەواژەیە فـاکتێکی تەواوەتییـە ئـەوە کـەواتا ڕێلـەتیڤیزم بـوونی نییـە، چونکە ئەم فاکتەمان هەیە

ئەگەر ڕێلەتیڤە ئەوە کەواتا فاکتێکی تر هەیە لە دەرەوەی ئەم دەستەواژەیە

دەستەواژەی: هیچ فاکتێک بوونی نییە تەنها ئینتەرپریت هەیە ...

لەنێوان حەقیقەت و واقیعدا با خۆمان لەبیر نەکەین.

عەلی ئەحمەد

## بەشی دەیەم: زانین چییە؟

شەپۆلی زانیارییەکان

[١] زانیاریی گەردوونی:-

گەردوون لە سەرەتای درووستبوونیدا؛ هەتاوەکوو دەگات بە کۆتایی.

بە پێی نوێترین لێکۆڵینەوە زانستییە-ئەزموونییەکان؛ گەردوون ساڵانێکی زۆری ماوە، بەڵام گەردوون هەر چەندە زۆری مابێت؛ ڕاستییەکی بێشک ئەوەیە کەوا هەر لەناو دەچێت. کەواتا، گەردوون بریتییە لە زانیارییەکی-کاتی.

١. بنچینە بابەتییەکان :-

{ڕەتکردنەوەی ڕێژەگەرایی-ڕەها}

<فڕیدڕیک ویلّیام نیتچه/Friedrich Wilhelm Nietzsche> له پەڕتووکی <ویستی هێز>دا، دەئاخڤێت:- هیچ فاکتێک بوونی نییه، تەنها لێکدانەوەکان نەبێت. "No, facts is precisely what there is not, only interpretations" [Friedrich Nietzsche, The Will to Power, translated by Walter Kaufmann and R. J. Hollingdale § 481] لێرەدا <فڕیدڕیک ویلّیام نیتچه> پرسیێکی بنەڕەتی دەردەخات. (هەڵبەته به پێی <پسپۆڕانی فڕیدڕیک ویلّیام نیتچه> ئەم پەڕتووکه ئەگەریەتێکی زۆری تێدا هەیه کەوا دەستکاری کردرابێت لەلایەن خوشکەکەیەوە/-Elisabeth Förster Nietzsche – وه هەروەها ئەستەمیەتێکی زۆر لەم دەستەواژەدا هەیه کەوا لەلایەن خودی نووسەرەوە چا کرابێت. چونکه <فڕیدڕیک ویلّیام نیتچه> خۆی "باوەڕ"ی به کۆمەڵێک بەهاگەل هەبوو.).

سەرەتا، با بزانین ئەم دەستەواژەیە چی ئاڵنگارییەکی تێدا هەیە:-

ئەم دەستەواژەیە لە دوو بەشی سەرەکی  پێک هاتووە :-

بەشی یەکەم:-

١) هیچ فاکتێک بوونی نییە.

١.١) فاکت بوونی نییە.

---

بەشی دووەم:-

٢) لێکدانەوەکان بوونیان هەیە.

٢.١) لێکدانەوە بوونی هەیە.

---

وێنەیەکی لۆژیکی :-

فـ = ٠

لـ = +١

{تەنها یەک فاکت بوونی هەیە}

ئەم دەستەواژەیەی <فڕیدڕیک ویلّیام نیتچە> خۆی بریتییە لە فاکتێک. لەبەر ئەوەی <لێکدانەوەکان> دەکات بە پێشمەرجی هەموو فاکتێک. کەواتا: تاکە فاکت لەنێو ئەم گەردوونەدا ئامادەیی هەبێت، بریتییە لە :- هیچ فاکتێک بوونی نییە، تەنها لێکدانەوە نەبێت. وادابنێ کەوا ئەم دەستەواژەیە ڕاستە و، تەنها یەک فاکت لە گەردووندا بوونی هەیە. کە بریتییە لەوەی کە هیچ فاکتێک بوونی نییە.

{لێکدژی دەستەواژەی <تەنها یەک فاکت بوونی هەیە، ئەویش ئەوەیە کە هیچ فاکتێک بوونی نییە>}

$$\begin{gathered} F = 0 \\ I = \infty \\ - \end{gathered}$$

$$\begin{bmatrix} F = 1 \\ F = 0, I = \infty \\ \{1\} \end{bmatrix} - \begin{bmatrix} F = \infty \\ I = \infty = F = \infty \\ \{2\} \end{bmatrix} - \begin{bmatrix} F = \infty \neq I = \infty \\ \therefore F = \infty \therefore I = 0 \\ \{3\} \end{bmatrix}$$

## ١. زانین له دژی زانین؛ چرکەساتە-ئێپیستیمۆلۆژییەکان

{چەمکی <زانین> بیڕیشەییە}

بێشک هەموومان دەزانین کەوا دەستەواژەی :- < <زانین> = <زانین> > "ڕاستەوانە"یە. بەڵام <زانین> خۆی بریتییە لە سێتێک کە لە کۆمەڵێک بنەما/بنچینە/پرۆسێس/هاوپەیوەندی پێک هاتووە. ئێمەی مرۆڤ هەوڵ دەدەین <بابەتگەلێکی لەیەکترنزیک> بخەین بەناو یەک سێت. چەمکی <زانین> کۆمەڵێک پانتایی دەگرێت کە هەر لە "<زانینی ناڕاست>' هەتاوەکوو "<زانینی ڕاست>" دەبێت. لێرەدا چەمکی <زانین> وەکوو <پێکهاتەیەکی بیڕیشە> دەردەکەوێت. چەمکی <زانین>

ئەگەریەتی <بەزانیننەبوون>ی "<زانینی ناڕاست>" دەرناخات/جیای ناکاتەوە. کەواتا :- <زانین> بریتییە لە هەموو زانینێکی ڕاست و ناڕاست. کە ئەمەش درۆ و نەزانینیش دەگرێت.

{چی بە <زانین> هەژمار دەکردرێت؟}

وادابنێ ئێمە لەبەردەم چەند جۆرێکی زانین داین :-

١) "<زانین>"ێک بریتییە لە <١+١=٢> (دەستەواژە بیرکارییەکان).

٢) "<زانین>"ێک بریتییە لە <چەمچەماڵ> (ڕووداوی ڕابردووی نەگۆڕ/دەستەواژەی ڕوویداو).

٣) "<زانین>"ێک بریتییە لە <١+١=٥> (لەبەر ئەوەی نووسینە، کەواتا ئەستەم نییە).

٤) <زانین> بەوەی کەوا <نایزانین>، بریتییە لە <زانین>. (زانین دەربارەی نەزاندراوەکان).

{چی بە <زانیاری> هەژمار دەکرێت؟}

وادابنێ کەوا <زانیاری> بریتییە لە کۆمەڵێک دەستەواژەی هاوشێوەی :-

١)"قەڵای هەولێر سێ-هەزار ساڵ پێش ئێستا درووست کراوە". (ڕووودان)

٢)"چەمچەماڵ شارێکی دڵگیرە" (بەگوێرەگەرایی)

٣)"کوردستان جوانە" (بەگوێرەگەرایی)

ئەم دەستەواژانە هەموو بە <زانیاری> لەقەڵەم دراون لەلایەن کۆتاک و تاکەکان. بەڵام ئایە بە چی پاساوێک دەستەواژەی <کوردستان جوانە> جیاوازە لەگەڵ <١+١= ٢>؟ ئەمەش دەگەڕێتەوە سەر خاڵێکی بنەڕەتی:- دەستەواژەی <١+١=٢>، بریتییە لە <ڕاستییەکی-جێگیر>.

بـــــەڵام <کوردســـــتان جوانـــــە>، دەســـــتەواژەیەکی <بەگوێرەگەرایی/ناجێگیر>ە.

{چی گۆڕانێـک/جووڵەیـەک دەبێت بـە هۆکـاری هـەبوونی جیاوازی لەنێوان <زانین> و <زانیاری>}

هـەموو <زانیـاری>یـەک بریتییـە لـە <زانین>. بـەڵام هـەموو <زانینێـک> بریـتی نییـە لـە <زانیـاری>. <زانین> وەکـوو <ســـــێتێکی ســـــەربەخۆ>، بریتییـــــە لـــــە هـــــەموو جووڵە/گۆڕان/داتاکان.

{ زانین } = زانیاری.

{ زانیاری } = ئەزموونکردرای پێشینیانە/پاشینیانە.

کـــــەواتا :- {زانین:زانیـــــاری} = ئـــــەزموونکردرای پێشینیانە/پاشینیانە.

<ئـەزموونکردرای پێشـینیانە/پاشـینیانە> بـەبێ هـەبوونی <ئەزموونکار>ێک ئەستەمە. چونکـە <زانین> پەیوەسـتە/لـە

هاوپەیوەندیدایــە بــە <ئــەزموونکار>. <ئــەزموونکار>ێکی وەکوو :- <دەرکەوتــەی میکـانیکی-ســەربەخۆ>، ئەگەریــەتی ئــــەزموونکردنی تێــــدا هەیــــە. کــــەواتا، ئەگەریــــەتی بەدەســـتهێنان/کەوتنەنێوپرۆسێســـی <زانین>ی تێـدا هەیــە. ئەگەر ئێمە بە پرۆسێسی قۆناغبەندی ئـەم <زانین>ـەدا ڕێ بکــەین. ئــەوا دەگــەین بــەو ئەنجامــەی کــەوا :- %٩٩ی <زانینەکانمان> بەگوێرەگەراین. وە هەروەها پەیوەستن بـە <پێوەرەکــانی-ئــەزموونکردرای پێشــینیانە/پاشــینیانە>. <پێوەرەکانی-ئەزموونکردرای پێشینیانە/پاشینیانە>، بریـتین لەم تێزانەی خوارێ :-

١) بەگوێرەگەرایی. "ڕێژەگەرایی" – Relativism.

١.١) بەگوێرەگــەرایی-خــودی :- خواردنەکــە بــەتام بــوو. Subjective Relativism.

١.٢) بەگوێرەگەرایی-بابەتی:- خواردنەکە بەتام بوو. <هەڵسووڕانی-بایۆسایکۆلۆژی> Objective Relativism.

١.٣) بەگوێرەگەرایی-خودی بریتییە لە بەگوێرەگەرایی-بابەتی ناڕاستەوخۆ.Relativization subject-object.

٢) ڕوویدای <دەرکەوتەی میکانیکی سەربەخۆ> و <کۆتاک> -- The Happening.

---

ئەوەی مرۆڤ لە ئاژەڵ جیا دەکاتەوە ناسینەوەی چاکە و خراپەیە.

— عەلی ئەحمەد.

# بەشی یازدەیەم: بەکاڵاکردن

[هێرشبردن]

" دەبێت هەندێک دڵ، بشکێندرێن" ...

هێرشی پاکتاوکردنی پانتاییە-پۆڕنۆگرافیکەکانی سەرهێڵ. لێرەدا دەبێت ئاماژە بە خاڵێکی گرینگ بکەین؛ ئەویش بریتییە لە خودی <سەرهێڵ>/ئینتەرنێت.

لێرەدا ئێمە دەستوپەنجەمان تێکەڵە لەگەڵ کۆمەڵێک هاتوچۆکردنی سەرهێڵی و؛ پێویستیمان بە ئەوە هەیە کەوا ئەم هاتوچۆکردنە ڕابگرین. تێکشکاندنی تەواوی بنکەدراوەکان [داتابەیس] و هەڵگرەکان [سێرڤەر]

[پۆڕنۆگرافیا وەکوو جێگرەوە]

لە سەردەمی مۆدێرنیتەدا، هەموو تشتەکان دەبن بە سەرمایە. دەبن بە دەستکەوت. "ئێمە هەموو جێگرەوەیەکمان هەیە"

ئایە پێویستیت بە پڕکردنەوەی هەستپێکردنی جووتبوونە؟

"دوودڵ مەبە!"

ئێستا تۆ دەتوانیت چێژ لە /ملیاران/ جۆری وشانی-ئەلیکترۆنی وەربگریت. لەناو وەشانە ئەلیکترۆنییەکاندا، بڕگەی دۆپامین [Dopamine] دەنێردرێن لەبۆ وەرگرەکانی مێشکت.

— پۆڕنۆگرافی، بریتییە لە دەرچوونی کۆئەندامی زاوزێ لەبۆ ناو پانتاییە ئەلیکترۆنییەکان و کەوتنەناو سووڕێکی خودشکێن. "وادابنێ هەموومان تەماشای پۆڕنۆگرافیا بکەین" سوودبەخشێک لە سوودبەخشێکی دیکە باشترە/کاتبەسەربردنێک لە کاتبەسەربردنێکی دیکە باشترە.

**پۆڕنۆگرافیا :- ماددەی هۆشبەری هەزارەی سێیەم**

دەروازە:- <ڕووکەشگەرایی> و <نواندنگەرایی> لە پلەی باڵادا. — لە ماددەی-هۆشبەری پۆڕنۆگرافیادا، مرۆڤەکان

نواندنکاری دەکەن. دەبن بە نواندن. خودی نواندن. هەڵبەتە ئەمە جۆرێک لە نواندن نییە کەوا شانۆنامەیەک بێت. شانۆیەک بێت لە پلە-و-ئاستێکی هونەریدا بێت. چونکە هەروەکوو دەزانین، هونەر بەندە بە کۆمەڵێک بنەمای <ناغەریزەیی>. بەڵام لەنێو پانتایی ماددەی-هۆشبەری پۆڕنۆگرافیدا، هەر هیچ جۆرێک لە هونەر بەدی ناکرێت. وە تەنانەت ناتواندرێت هونەر لەناویدا بێت بە بەرهەمهێنان و بچێت لەبۆ ناو پڕۆسیسی بەرهەمهێنانی هونەر. تەنانەت ناتوانێت پڕۆسێسەکە بەگەڕ بخات. چی جای ئەوەی بتوانێت قەڵەمڕەوی لەسەر خودی پڕۆسێسەکە بکات.

خودی پڕۆسێسی پۆڕنۆگرافی، وە پۆڕنۆگرافی وەکوو کاڵایەک، پێشمەرجی بوون بە پۆڕنۆگرافی. وە بوون بە بەرهەمی پۆڕنۆگرافی، بریتییە لە ڕەتکردنەوەی هونەر. چونکە، پۆڕنۆگرافی، دابەشکراوە بەسەر چەند بنەمایەکی دژە-هونەری. <پۆڕنۆگرافی وەکوو کاڵا>، خودی ئەم

دەستەواژەیە، کە ئاماژەیە بە <کالاّ>، بریتییە لە نەبوون و دیارنەمانی هونەر. وە لە ڕابردوودا[، بە گوێرەی ڕابردووی ئەم پەڕتووکە] هەوڵێکی زۆر دراوە سەبارەت بە <هونەریکردن>ی پۆڕنۆگرافیا. ئەویش بەهۆی بەکارهێنانی ئامڕازە ئیرۆتیکییەکان. بەڵام خودی ئامڕازە ئیرۆتیکییەکان. بریتین لە پڕۆسێسی <بەکالاّکردن>ی بەرامبەر. وە بەکالاّکردنی ئەویتر. ئەویش لەبۆ بەکارهێنان. بەکارهێنانێک لەسەر بەرژەوەندی خودی بەرکاربەر. لێرەدا ئێمە <کالاّ>مان هەیە :- هەستی ئیرۆتیک. وە <بەکاربەر>یشمان هەیە. کاتێک کە دەتەوێت پۆڕنۆگرافیا، ماددەیەکی هۆشبەر، بخەیت بە ناو پڕۆسێسی <بەهونەرکردن>، ئەوا لێرەدا، کالاّیەک، دەبێت بە هونەر. ئەستەمیەتی <بەهونەربوونی-کالاّ> ئەوە دەردەخات کەوا خودی ئەم کالاّیە، پێکهاتەیەکی <خود-شکێنە>، تێکدانی هونەر خۆی.

<نواندنگەرایی> لە پلەی باڵادا :–

{نواندن لە خزمەتی نواندندا}

مرۆڤێک کە نواندن دەکات. کۆتاک لەنێو نواندندا. یەک مرۆڤ زیاتر... بەڵام چی جۆریک لە نواندن :– نواندنێک لەبۆ خودی <کردەی نواندن>. پڕۆسێسێک کە تیایدا <نواندن>، کردەی <نواندن> بە ئەنجام دەگەیەنێت. تەنانەت، گرینگ <بەئەنجامگەیاندن>یش نییە. جۆرێکە لە نواندنکاری، کەوا خودی پڕۆسەی نواندنەکە گرینگە. "تۆ تەنها دەبێت بنووێنیت". "هیچ پۆزێک لەم نواندنەدا نییە، ئەم نواندنە خزمەتکردنە بە نواندن". نواندنێک کە تیایدا لە سوورڕێکی بەردەوامدایە بەناو کۆمەڵێک پانتایی وەکوو :– ١) نواندنی کەسایەتییەک. ٢) نەبوونیەتی خۆم. نەبوونیەتی خود، هاوواتایە بەرامبەر بە بوون بە شتێک. بوون بە ماددەیەک. بوون بە مرۆڤێک کە دواجار هەر وەکوو ماددە ڕەچاو دەکرێت.

<به کاڵاکردنی کۆئەندامەکان>

ماددەی-هۆشبەری پۆڕنۆگرافی، خودی خۆی بریتییە لە کاڵایەک. بەکاربەرەکانیشی بریتین لە هەڵکێشان و بەکاربەرانی ماددە-هۆشبەرەکە. ماددەی-هۆشبەری پۆڕنۆگرافی، بریتییە لە بەکاڵاکردنی کۆئەندامەکان. خودی <ماددەی-هۆشبەری پۆڕنۆگرافی>، کاڵایە. بەکاربردنە. پرۆسێسێکی بەرخۆرانەیە. "چێژ ببینە". "چێژ ببەخشە". "تەنها چێژ"!. <ماددەی-هۆشبەری پۆڕنۆگرافیا>، خۆی لەنێو ئەم گوتارانەدا دەبینێتەوە.

---

سەرەتا خۆت بە، ئینجا ئەوانی دیکە ...

— عەلی ئەحمەد.

# بەشی دوانزدەیەم: توێکاری خودی

پێشەکی [لەبۆهاتنی-خودی]

گرینگترین/سەیرترین/سەرەکیترین "کێشە"، لەم باسەدا/پرسە ئەوەیە کەوا ئایە/ئاخۆ من لە کوێڕا دەست پێ بکەم... بەڵام لە هەمانکاتدا هەست دەکەم کەوا ئەمە لە ڕاستیدا کێشەیەک نییە. بەڵکوو بریتییە لە کۆمەڵێک گرێ و بەسەریەکدا کەوتن. کە دەبێت و دەتواندرێت ئەم گرێ و بەسەریەکدا کەوتنانە بکرێنە و ڕێک بخرێن. گرینگترین خاڵ لەم توێژینەوەیەدا بریتییە لە دوو خاڵی سەرەکی :- ١) ئەمە دەبێت بە توێژینەوەیەک لەبۆ من، وە یەکدەگرێتەوە لەگەڵ <ویستی هەبوونی توێژینەوە>م، کە ویستێکی پاکە. ٢) گرینگترین خاڵ لەم توێژینەوەیەدا، دەرکپێکردنی و ڕاستییەیە کەوا بەڵێ، دەتواندرێت کردەی <ڕۆشنەپێکهاتنی مێشک> و بەتایبەتتر:- کردەی <ڕۆشنەپێکهاتنی

خۆییبوون/خـودی> بـه ئـهنجام بگەیەندرێت. بـه پێچەوانـەی ئەوەی کـەوا بـاو بـوو [یـاخود ئـەوەی کـەوا هـەر دەزانـدرا]، ئێمه دەتوانین کردەی <ڕۆشنەپێکهاتن> به ئەنجام بگەیـەنن. لـە ڕاسـتیدا هەڵبەتـە گرینگـترین خـاڵ لـەم توێژینەوەیـەدا بریتییه له تێگەیشـتن لـه دۆخەکـە/پرۆسێسـەکە/جووڵانـەکان. کاتێک کـە تێگەیشـتیت لـه دۆخەکـە، ئینجـا دەگەڕێتـەوە سـەر خودی خۆت کە ئاخۆ دەبێت چی بکـەیت و چی نەکـەیت. وە دەبێت چی نەکـــەیت، وە دەبێت چی بکـــەیت. ئینجـــا بـــە تـــەواوەتی دەکـــەویت لـــەبۆ نـــاو <دەبێت و نـــەبێت>ـــە سـەرەکییەکانی ژیـان. ژیـان لێرەدا بـە مانـای خـۆت. چونکـه ئێمـــه تـــەنها دەتـــوانین کاریگـــەری درووســـت بکـــەین و پرۆسێسی کاریگەری، به ئەنجام بگەیـەنن. نـەوەکوو توانـای <گۆڕانکـــــــــــــــاری-ڕاســـــــــــــــتەوخۆ>.

---

[پێناســـەکردنی چـــەمکی <ڕۆشـــنەپێکهاتنی خۆییبـــوون>]

<ڕۆشنەپێکهاتنی خۆییبوون>. ئەم ناوەم لەم پڕۆسێسە ناوە کەوا، تیایدا من وەکوو <عەلی ئەحمەد>. واتا وەکوو خۆم. وەکوو ئەوەی کە هەم، وە وەکوو ئەوەی کە دەبم. پڕۆسێسێکە کە بریتییە لە ناسینی تەواوەتی ئەم <عەلی ئەحمەد>ە. کە ئەمەش دەبێت بە ناسینی خۆم. کاتێک کە ناسیم/زانیم کەوا <عەلی ئەحمەد> کێیە، ئەوا دەتوانم باشتر/زیاتر خۆم دەناسم.

---

[چەند <عەلی ئەحمەد> بوونیان هەیە لەنێو مێشکمدا]

[بیرۆکەی <هەبوونی سێ+١ عەلی ئەحمەد لەنێو مێشکمدا>]

کەواتا، لێرەدا سێ <عەلی ئەحمەد> بوونی هەیە.

١) <عەلی ئەحمەد وەکوو خۆم> = خۆم.

٢) <عەلی ئەحمەد وەکوو ئەوەی کە هەم>. = <ئێستاییبوون>.

۳) <عەلی ئەحمەد وەکوو ئەوەی کە دەبم>. = <داهاتوویی>. [٤) <عەلی ئەحمەد وەکوو ئەوەی کە هەبووم>. = <ڕوویداو/ڕابردوو>.

---

سێتی {بنکەی زانیاری}

هەڵگرتنی زانیارییەکان.

---

زانیاری چییە؟

{هەموو ئەوەی کە دەیزانیت} = <هەموو ئەوەی کە ئەزموونت کردووە>

زانیاری بریتییە لە :-

سێتی {دەرەوە} :-

{زانیاری سەبارەت بە خۆت}

{زانیاری سەبارەت بە دەورووبەری خۆت}

---

زانیارییەکان هیچ مانایەکیان نییە لە خۆیاندا. بەڵکوو ئەوە <بنکەی پاراستنی کۆئەندامەکانە>، کەوا بڕیار لەسەر بارودۆخی ئەرێنی و نەرێنی زانیارییەکان دەدات.

[سەلمێندراوەکان]

بیرۆکەکان :-

ڕوودانەکان :-

بیرۆکەکان :-

١) سێتی هەموو ناوەکان :- {ناو}

٢) سێتی هەموو هاوەڵناوەکان :- {هاوەڵناو}

---

کوردستان جوانە.

تورک بەهێزترە لە کورد.

کوردستان = ناو + جوان = هاوەڵناو + ە = ڕوودان.

تورک = ناو + بەهێزتر = هاوڵناو...

---

لێرەدا دەبینین کەوا هەموو گوتارەکانمان تەنها بیرۆکەکانن.

بەڵام ڕوودانەکان جیاوازن لە بیرۆکەکان. کە ئەمانیش

دابەش دەبن لەبۆ ئەم سێتانەی خوارەوە :-

ڕوویداو :- دوێنێ، ئەزموون.

ڕوودانی بەردەوام :- ئێستاییبوون

ڕوودانی داهاتوو :- مەزندە، گریمانە.

ڕوودانی داهاتووی بێ-ئەگەر = بەڵگەنەویستی ڕوودەر.

---

هەڵسووکەوتمان لەگەڵ بیرۆکەکان = جیهانبینی = ڕوودان.

پێشاندانەکان :-

{خۆڕسکەبنکەی هەموارکردنەوەی کۆئەندامەکان}

پێشاندانەکان لە {بنکەی زانیاری} دەردەهێنێت.

وە پاشان پەخشی دەکات لەنێو {بنکەی بڕاردان}.

---

بڕیارەکانی بنکەی بڕیاردان :-

١) قبووڵکردنی بیرۆکەکە (ڕەتکردنەوەی ناڕاستەوخۆ).

٢) تێکەڵبوون بە بیرۆکەکە (ئەزموونکردنی بیرۆکەکە)

٣) ؟؟؟

چەمکە سەرەکییەکان :-

<کاتێک لەنێویت، ئاگامەند نیت>

<ناوەندی بڕیاردان>

<بنکەی زانیاری>

<پاراستنی تۆڕی زانیارییەکان>

<ناوکی ناوەندی بڕیاردان>

---

زانیاری :-

{بنکەی ئاڵوگۆڕی زانیاری} :- بەدەستهێنان و بەیەکلکاندن.

{بنکەی زانیاری} :- هەڵگرتنی زانیارییەکان.

مێشکی خۆم :-

١) ئەزموونديدەی بەردەوام (خۆم)

<ئەزموونکردن>ی بیرۆکەکان :- بیرکردنەوەم لە <مایکڵ-جاکسۆن> کە چۆن لەگەڵ بەرژەوەندی من ناگونجێت.

<ئەزموونکردن>ی لەش :- ئازاری کۆئەندامێک

نەخشەکە :- ؟؟؟

خۆڕسکەبنکەکان :-

٠) خۆڕسکەبنکەی پەیڕەودانی بەردەوام.

١) خۆڕسکەبنکەی پەخشکردنی بەردەوام.

٢) خۆڕسکەبنکەی هەموارکردنەوەی بەردەوام کۆئەندامەکان.

٣) خۆڕسکەبنکەی بەردەوام بڕیاردانی هەڵبژاردەی پێویست.

---

پەتییەبنکەکان:-

١) پەتییەبنکەی زانیاری. (زانیاری هەڵگیراو)

٢) پەتییەبنکەی ئامڕازەکانی وەرگرتنی زانیاری.

٣) پەتییەبنکەی سەرنجدان

---

سەلمێندراوەکان :-

سیستەم-سێتی مرۆڤ

{...ڕووداوەکان >>> بیرۆکەکان >>> ڕووداوەکان...}

١) بیرۆکەکان:-

{سێتی غەم} - {سێتی ناوەکان} - {سێتی هاوەڵناوەکان}

٢) ڕوویدا - ڕوودان - ڕوودەدات:-

کاتێک برسیمە :-

خۆڕسکەبنکەی هەموارکردنەوەی بەردەوامی کۆئەندامەکان، ئاگاداری دەنێرێت لەبۆ خۆڕسکەبنکەی بڕیاردانی هەڵبژاردەی پێویست. خۆڕسکەبنکەی بڕیاردانی هەڵبژاردەی پێویست، پێویستییەت دەردەهێنێت بەهۆی لێکدانی زانیارییەکان کە لەنێو <بنکەی زانیاری>دان.

سەلمێندراوەکان

بیرۆکەکان :-

ڕوودانەکان :-

بیرۆکەکان :-

١) سێتی هەموو ناوەکان :- {ناو}

٢) سێتی هەموو هاوەڵناوەکان :- {هاوەڵناو}

---

کوردستان جوانە.

تورک بەهێزترە لە کورد.

کوردستان = ناو + جوان = هاوەڵناو + ە = ڕووداو.

تورک = ناو + بەهێزتر = هاوڵناو...

---

لێرەدا دەبینین کەوا هەموو گوتارەکانمان تەنها بیرۆکەکانن.

بەڵام ڕووداوەکان جیاوازن لە بیرۆکەکان. کە ئەمانیش

دابەش دەبن لەبۆ ئەم سێتانەی خوارەوە :-

ڕوویداو :– دوێنێ، ئەزموون.

ڕوودانی بەردەوام :– ئێستاییبوون

ڕوودانی داهاتوو :– مەزندە، گریمانە.

ڕوودانی داهاتووی بێ–ئەگەر = بەڵگەنەویستی ڕوودەر.

---

هەڵسووکەوتمان لەگەڵ بیرۆکەکان = جیهانبینی = ڕوودان.

هەندێک جار پێویستە مرۆڤ بەخۆیدا بچێتەوە ...

— عەلی ئەحمەد.

# بەشی سیانزدەیەم: بابەتەکان

**پێش گەردوون:**

کاتێک باس لە بابەتی <پێش گەردوون> دەکەین. ئێمە لەبەردەم چەند گریمانەیەکداین.

**یەکەم: گەردوون هەر هەبووە و ئەزەلییە.**

ئەم گریمانەیە جەخت دەکاتەوە لەسەر هەبوون و ئامادەبوونی گەردوون هەر لە دێر زەمانەوە. — واتا تشتێک بە ناوی خاڵی سەرەتا بوونی نەبووە و، تشتێکیش بە ناوی خاڵی کۆتایی بوونی نابێت. — بوونی خودا لەم گریمانەیەدا پەیوەستە بە هەبوونی خودی گەردوون. — گەردوون لەم گریمانەیەدا خودایە و ڕەهایە.

**دووەم : گەردوون پێشتر بوونی نەبووە و هاتووەتە بوون.**

ئەم گریمانەیە جەخت لەسەر کۆمەڵێک چەمکی هاوشێوەی [پەیدابوون — دەرکەوتن — هاتنەبوون — دروستبوون

— ...] دەکاتەوە. لەم گریمانەیەدا پرسێک بە ناوی<پێش- گەردوون> بوونی هەیە. بەڵام لە گریمانەی ئەزەلیبوونی گەردووندا، تشتێک بوونی نییە بەم ناوەوە.

**جۆرەکانی هاتنەبوون**

١. هاتنەبوون لە نەبوون بۆ بوون. (**Binary Pop**)

یاسای ئەم جۆرە هاتنەبوونە:

١. بیر لە بۆشایی بکەوە.

١.١. بیر بکەوە لەناو بۆشاییەکەدا لەناکاو تۆپێک بێتە بوون.

---

مەرجەکانی بەرپابوونی ئەم جۆرە هاتنەبوونە:

١. دەبێت بۆشاییەک بوونی هەبێت بۆ ئەوەی ماددەکەی لەناویدا دەربکەوێت.

١.١ دەرکەوتنی ئەم ماددەیە پەیوەندی بە کاتەوە نییە و لە کات بەدەرە. چونکە خاڵی دەستپێکردنی نییە. وە بۆشاییەکە بە (سفڕ) حیساب دەکرێت و، دەرکەوتنەکەش بە (یەک) حیساب دەکرێت.

١.٢. دەرکەوتنی ئەم ماددەیە، یان ئەوەتا پەیوەندی بە خودی بۆشاییەکەیەوە هەیە. یانیش لە دەرەوەی بۆشاییەکە بڕیاری لەسەر دراوە.

هێڵکاری:




بۆشایی لێرەدا وەکوو بەهای (سفڕ) هەژمار دەکرێت و، دەرکەوتنەکەش لە بەهای (یەک)دایە.

**سیازدە ملیار ساڵ [١٣.٧] پێش ئێستا چی ڕوویدا؟**

خودی بۆشایی، بریتییە لە شت. شت بریتییە لە بوون. بۆشایی بوونە. نەوەکوو نەبوون. وە لە کۆتاییدا لەسەر بۆشایی ماددە دەردەکەوێت. بۆشایی پانتاییەکە بۆ پەیدابوون و دانانی ماددەکان لەناویدا.

**بۆشایی چییە؟**

بۆشـایی بریتییـە لـەو پانتاییـە نەبینـدراوەی کـە ماددەکـان و زاندراوەکان لەسەریدا چەسپاون. پێش-بۆشایی.

---

بـــە لـــۆژیکی نـــاوەوەی گـــەردوون ناتوانـــدرێت دەرەوەی گەردوون ساغ بکرێتەوە. — بەڵام کێشەکە ئەوەیە تا ئێسـتا نازانین لۆژیکی ناوەوەی گەردوون چۆنە.

جۆرەکانی هاتنەبوون

١. هاتنەبوون لە نەبوون بۆ بوون. (**Binary Pop**)




٢. هاتنەبوونی لەسەرخۆ (**Timed Pop**)




---

**[قسەوباسەکانمان]**

ئەقڵە بەهێزەکان بیرۆکەکان تاوتوێ دەکەن.

ئەقڵە ناوەنجییەکان ڕووداوەکان تاوتوێ دەکەن.

ئەقڵە لاوازەکان خەڵکان تاوتوێ دەکەن. — سوکرات

١- {لە ئێستادا} ئەمن وەها هەست دەکەم کەوا هەندێک لە قسەکردن و گۆتنەکانمان هیچ سوودێک/چاکەیەک/ئارامییەک ناگەیەنن و نایبەخشن. ئەمەش واتای ئەوەیە کەوا دەبێت ئێمە بەخۆماندا بچینەوە و بزانین کەوا ئاخۆ؛ لە ڕاستیدا قسەکردن سوودی چییە؟ یاخود بەتایبەتتر: ئەو قسەکردنانەی کە ئێمە دەیانکەین.

پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە کەوا: ئایە ئێمە چی جۆریک لە قسەکردن بەرجەستە دەکەین؟ ئایە قسەکردن و گۆتەکانمان باس لە چی دەکەن؟ ئایە ئەوان سەر بە <ڕەوەندی بیرۆکەکان>ن، یاخود سەر بە <ڕەوەندی مرۆڤەکان>ن. چونکە لە هەر کۆبوونەوەیەک/کۆباسێکدا، بابەتەکان بریتی بوون لە <مرۆڤەکانی تر>، <ئەوانی تر>، <دەرەوەی بیرۆکەکان>، ئەوا ئەم کۆبوونەوە و قسەکردنە دەبێت بە پرسەیەک کەوا تیایدا ئەوەی باسی لێوە دەکرێت، وە ئەو بابەتانەی کەوا دەوروژێندرێت؛ تەنها بریتین لە <قسەوقسەڵۆک>. کە ئەمەش بە دوو شێواز زیانی هەیە/سوودی نییە :- ١) هەموو کەسێک دەتوانێت <قسەوقسەڵۆک> بکات. ئەمە پەیوەندی بە <توانایەک> و <هەوڵدانێک لەبۆ زانین> نییە. ٢) بەرهەم و ئەنجامی <قسەوقسەڵۆک> بریتییە لە دەرکەوتەیەکی نەرێنیەتی و <دەرپەڕاندنی وزەی نەرێنی>. کە وەها لە مرۆڤ دەکەن

زیاتر <دژە-ژیان> {بـ}بێت و، وەها جیهان ببینێت کەوا تەنها بریتییە لە <باسکردنی مرۆڤەکان>.

---

لێرەدا دەبینین کەوا زۆربەی قسەوباسەکانمان بەتاڵن. بەو واتایەی کەوا بەتاڵن لە ژیان. <بەتاڵبوون لە ژیان> بریتییە لە نەبوونی هەستێک لەبۆ ژیان. لەبۆ ژیانکردن و ژیانێکی باشتر. <هەوڵدانێک لەبۆ ژیانێکی باشتر/چاکتر>. ئەزموونی ڕابردوومان ئەوە دەردەخەن کەوا <قسەوقسەلۆک> و <باسکردنی مرۆڤەکان>، بێجگە لە زیاد/کاتکوشتن/خەساندنی-ئەقڵی، هیچ جۆرێک لە بەرهەم و ئامانجی نەبووە. کەواتا؛ لە باشترین حاڵەتدا، دەبێت قسەوباسەکانمان، بریتی بێت لە باسکردن/شیکارکردن/لێکۆڵینەوە لە بیرۆکەکان. چونکە ئەرکی سەرەکی <مێزی دانیشتن>، بریتییە لە قسەوباسێک لەسەر <بیرۆکەکان، ئایدیاکان>. چونکە

باسکردن/شیکردنەوە/لێکدانەوەی ئایدیاکان، هەم بەچێژترە و هەمیش لەدوای ڕۆیشتن/بەجێهێشتنی دانیشتنەکە، ئارامییەک بەدەست دەهێنیت.

---

ئەمن هەندێکجار بێزار دەبم لە قسەوباسەکان/دانیشتنەکان/گفتوگۆکان. چونکە باس لە بابەتگەلێک دەکەن کەوا سەرنجم ڕاناکێشن و وەها هەست دەکەم کەوا بێسوودن. لەبۆوێنە:- ١)باسکردنی بابەتگەلێکی وەکوو مرۆڤەکانی تر و ئەوانی تر. ٢)باسکردنی بابەتگەلێک کەوا ئەمن خۆم تێدا نابینمەوە. ئەگەرچی هەندێکجار لەگەڵ مرۆڤانی دەورووبەرم دواوم و قسەم کردووە سەبارەت بە بابەتگەلێک کەوا هەر لە بنەڕەتەوە حەزم پێیان نەکردووە، ئەوا لەبەر کەسی بەرامبەرم بووە کەوا پەرەم بە گفتوگۆکە داوە.

وە زۆرجاریش ویستوومە کەسی بەرامبەرم دڵخۆش بکـەم، چونکـە وەهـا هەسـتم کـردووە/پێشـبینیم کـردووە کـەوا ئـەو پێویســتی پێیــەتی، بــەڵام بــە پێچەوانــە بەســەرخۆمدا شـکاوەتەوە. وە لـەبۆم دەرکـەوتووە، کـەوا پێویسـت ناکـات لـەبۆ خـەڵک/کەسـەکان خـۆت مانـدوو بکـەیت بـە قسـەوباس لــەبۆ دڵخۆشــکردنیان. زۆرجــار کەســانێک ئــەتۆیان خۆشـدەوێت ئەگـەر قسـە بکـەیت یـاخود نەیکـەیت. یـاخود کەسانێک هەن کەوا بە بێدەنگی تۆیـان خۆشـدەوێت. کـەواتا؛ دەبێت میانڕەو بین. وە پێویست ناکات خـۆم بسـەلمێنم لـەبۆ هیچ کەسـێک لەسـەر قسەوباسـەکان و هـەوڵ بـدەم خـەڵک دڵخۆش بکەم.

---

**[وابەستەبوون بە مرۆڤ]**

مرۆڤی سەربەخۆ، هەرگیز وابەستە نابێت بە مرۆڤ

١– یەکێک لە <ئالوودەکان>ی هەزارەی سێیەم بریتییە لە <وابەستەبوون بە مرۆڤ>. گرینگیدان بە <مرۆڤ>. یاخود ڕاشکاوانەتر بیڵێم:– گرینگیدان بە <کەسانی–دەوروبەر> و <کەسە–نزیکەکان>مان. ئێمە هەمیشە بەدوای ڕەزامەندی <ئەوانی–تر> و <مرۆڤانی–دەرەوەی–خۆمان>ین. هەڵبەتە ئەم <ڕەزامەندی–دەرەکی>یە پەیوەستە/هاوپەیوەندە بە کۆمەڵێک بنەما و بنەچەی سایکۆ–بایۆلۆژی (Behavioral Neuroscience - biological psychology). بەڵام ئێمە لێرەدا دەستوپەنجەمان لەگەڵ بابەتێک تێهەڵکێش کردووە کەوا پەیوەستە بە چارەنووسی چەشنەکەمان. ئەگەرچی <بوون–بەخۆت>یش هاوپەیوەندە/پەیوەستە بە کۆمەڵێک بنەما/بنەچە سایکۆ–بایۆلۆژی، بەڵام لەبەرچی {و بەچی پاساوێک} دەبێت ئێمە باوەڕمان/ئامانجمان وەها بێت کەوا <بوون–بە–ئەوانیتر> و <ڕەزامەندیوەرگرتن–لە–دەرەوەی–خۆمان>مان پێ باشتر/چاکتر/بەسوودتر/پێویستتر بێت؟...

١.٢- هەڵبەتە ئێمە درۆ لەگەڵ خۆماندا دەکەین و هەوڵ دەدەین خۆمان هەڵبخەڵەتێنین ئەگەر بڵێین کەوا ئێمە “پێویستیمان-بە-کەس-نییە” یاخود “تەنها-لەبۆ-خۆم-دەژیم” و “ڕەزامەندی-کەسم-ناوێت”. لەبەر ئەوەی {بمانەوێت-و-نەمانەوێت}، ئێمە هەر لە سەرەتای لەدایکبوونمان هەتاوەکوو <کوژانەوەی-هۆش>مان پێویستیمان بە <مرۆڤەکانی-تر> هەیە. لەبەر کۆمەڵێک هاوپەیوەندییەت و دەرکەوتەی کۆمەڵایەتی. کاتێک کە لەدایک دەبیت، ئەم ڕووداوە، پەیوەستە/هاوپەیوەندە بە هەبوونی دایباب. کەواتا، تەنانەت <بوون>ەکەشت پەیوەستە بە هەبوونی مرۆڤەکانی-تر و کەسانی-دەورووبەرت. لێرەدا پرسیارە بنچینەییەکە/جەوهەرییەکە ئەوەیە :- ئایە لەبەرچی/چۆن بوونێک {کە بریتییە لە خۆت}، بەرهەڵستی

<بوونگەرایی - Existentialism> و <تاکگەرایی-ڕەها> دەکات؟...

---

١.٣- بەڵام سەرەڕای ئەوەی کەوا ئێمە پێویستیمان بە <گیانی-هاوکاری> هەیە. وە هەرچەندە وەها خۆمان دەربخەین کەوا "تاک-سەنتەر" و "تاکگەراین" ئەوا هێشتان {هەر} لەسەر بنەمای <پێویستیگەرایی> و <"ناچارەکی"> پەیوەستین و لەنێو هاوپەیوەندیداین لەگەڵ مرۆڤەکانی تردا. لەگەڵ <ئەوانی-تر>دا. سەرەڕای ئەم خاڵە. ئێمە، دەبێت {هەوڵ بدەین} لەنێو ژیانمان و کردەی٠ژیانکردنماندا، خۆمان لەنێو پڕۆسێسێکدا بین کەوا لێوانلێو بێت لە <کردەی-سەربەخۆخوازانە>. کردەگەلێک کەوا دەیسەلمێنن {لەبۆ خۆت} کەوا بەخۆت هەیت. وە خاوەنی <بوونی-سەربەخۆ>ی خۆتی. وە هەروەها {هەرگیز} پێویست ناکات سەربەخۆییبوونت بسەلمێنیت لەبۆ مرۆڤەکانی تر. لێبگەڕێ

با خۆیان لەنێو تۆدا ببینن و "هەست"ی پێ بکەن. وە ئەگەرچی زۆر ئاساییە کە ئەم پاڵنەرەمان لەناخماندا بەرجەستە بووبێت/دەبێت (یاخود هەبێت) کە پێی دەگوترێت <گیانی-هاوکاری>. وە بەڕاستیش هەوڵی پەرەپێدانی <گیانی-هاوکاری> بدەین. بەڵام بابەتگەلێک هەن کەوا تایبەتن بە خود. کەوا هەرگیز نابێت لەژێر پەردەی <گیانی-هاوکاری> و، بەناوی <گیانی-هاوکاری> لە خود بستێندرێن (کە هەڵبەتە ئەم خاڵەش دەگەڕێتەوە سەر <خودی٠مرۆڤ>ەکە کە هەتاوەکوو چەند لەگەڵ خۆیدا ڕاستگۆیە و ئامادە نییە بچێت لەبۆ بن هیچ بڕیار و مەرامی <مرۆڤێک لە دەرەوەی بوونەکەی خۆیدا>). لەبۆ مرۆڤێک کەوا سەربەخۆخوازە، وە {هەرگیز} ئامادە نییە دەستبەرداری ئەم بنەمایەی ژیانی بێت، ئەوا هەرگیز ناهێڵێت <مرۆڤەکانی-تر> {وە تەنانەت نێزیکترین کەسی ژیانیشی}، لە بەهاگەلێک دووری بخەنەوە کە خۆی پێی

لەسەر داگرتووە. دەکرێت بڵێین لەبۆوێنە؛ کۆمەڵە بەهایەکی وەکوو :-

١- <بنەما-ناوەکییەکانی-خود>

٢- <ویستی-خود>

٣- <ویستی-گوتنی-نەخێر>

وە هەروەها چەندین بەهاگەلی تر، کە تایبەتن بە خودی کەسەکە و، ئەو <لەبۆ-خۆی-و-تەنها-لەبەر-خۆی> باوەڕ و <پەیڕەوی-ژیان>ی لەسەر ئەو بەهایانە دادەنێت.

---

١.٤- لە ئێستادا، مرۆڤەکان خەریکی <کردەی-مرۆڤەکانی-تر>ن. واتا نەک تەنها ئامادەن تەنهاوتەنها کردەی مرۆڤەکانی تر دووبارە و لاسایی بکەنەوە؛ بەڵکوو ئامادەشن وەکوو مرۆڤەکای تر بن. لێرەدا دۆخەکە <مرۆڤ-لەبۆ-مرۆڤ-و-مرۆڤ-و-مرۆڤیانییە!> واتا :-

کاتێـک کـە خـۆت وەکـوو مرۆڤێـک، ئەوەنـدە ئـاڵوودەی مرۆڤێکی تریت، ئەوا ئەم بارودۆخـە وەهـای لێ دەکەوێتـەوە کـەوا ئـەتۆ خـاوەنی هیچ شووناسـێکی-سـەربەخۆ نیت. لـە ڕاسـتیدا، ئەمـە واتـا خـاوەنی <بـوونێکی-سـەربەخۆ> نیت. هەڵبەتە ئایدیای <بوونێکی-سەربەخۆ> لـە هەنـدێک ڕووداو و دەرکەوتەدا، ئەوەندەی زیـان/خراپـە/نـەزانی لێ دەکـەوێت، چاکـە/سـوود/پێویسـتی لێ ناکـەوێت. ئاسـاییە هەندێک-کـات سـەربەخۆخوازانە نـەبێت لەبرامبـەر کردەیـەکی گـەورەتر/چـاکتر، یـاخود ئاامنجێـک کـە لـەلات چـاکترە لـە هـەبوونی <بـوونی-خـۆت>. زۆرجـار ئێمـە پێویسـتیمان بـە <ئاسـایش> هەیـە. وە <ئاسـایش> دەسـتبەرداری سـەربەخۆبوونەکەی بـووە و بڕیـار لـە دەرەوەی خـۆی وەردەگـرێت. واتـا لـەبۆ هەنـدێک لـە سـێکتەر و پێگـە کۆمەڵایەتییەکان، ئەوەندەی گرووپـەکان بڕیـار لـە دەرەوەی

خۆیـان وەردەگـرن، لـەنێو خۆیانـدا وەری نـاگرن و، تـەنها جێبەجێکارێک لەبۆ بڕیارەکەی دەرەوەی خۆیان.

١.٥- ئەگـەر بـەوردی سـەرنجێکت لـە دەورووبەرەکـەت و ژینگەکەت دابێت. ئـەوا تەماشـا دەکـەیت {کـە ڕەنگـە} ئاسـتی (خزمگەرایی-دۆستگەرایی-هاوڕێگەرایی — Nepotism) لە ئاسـتێکی دیـاردا بێت. لـە ڕاسـتیدا گرینـگ نییـە ئاسـتەکە ڕێژەکـــەی چەنـــدە بـــەرزە، بـــەڵکوو لـــێرەدا پرســـیارە ســـــەرەکییەکە ئەوەیـــــە کـــــەوا:- لەبـــــەرچی مـــــرۆڤ هەڵدەبژێردرێت؟

مرۆڤەکان بە پێی هەبوون و پابەندبوون بە چەند بنەمایەکی سایکۆ-بایۆلۆژی، {بـە پـێی کـات-و-بـارودۆخ} حـەز دەکـەن لەگەڵ مرۆڤەکانی تردا بن. وە کاریگەری بەرهەمی کەسێک، بـەبێ پێشـاندانی ڕووخسـار و جەسـتە و بـاڵای کەسـەکە، ئەوەنـدە بایـەخی نـابێت. بۆوێنـە:- ئایـە ئەگـەر <فـەرهاد-

پیربال> کەسایەتییەکی سەرنجئامێز و سەرسوڕماناوی نەبووایە، وە تەنها ناوێک بووایە لەسەر کاغەز و بەرگی پەڕتووکەکاندا، ئایە چەند بەرهەم و گوتارەکانی کاریگەرییان دەبوو؟ ئایە کاریگەری پەڕتووکەکانی/بەرهەمەکانی، ئەوەندە دەبوو ئەگەر خۆی دەرنەخستبا؟ لێرەدا پرسیارەکە ئەوە نییە کە ئایە <فەرهاد-پیربال> ڕووکەشگەرایە یاخود نەخێر. بەڵکوو تێزەکە ئەوەیە کەوا :- تۆزێک {تەنها-تۆزێک} سەختە بەرهەمێک بەبێ بیرکردنەوە لە مرۆڤێک وێنا بکەین و هەڵسووڕانی لەگەڵدا بکەین.

هەرچەندە خودی خۆم، وەکوو نووسەری ئەم پەڕتووکە، حەز دەکەم خۆم بچم لەبۆ لای کەسێک/شوێنێک کاتێک کە بەرهەمێکم هەیە، بەڵام لەبۆ <ئەوانی-تر> و <مرۆڤەکانی-تر>، وام پێ باشترە کە بەبێ ڕەچاوکردنی مرۆڤەکە، بەرهەمەکەیان لێ وەربگیردرێت. چونکە :- هەرگیز بە

ڕووکـەش هەڵمەخەڵـەتێ. لەوانەیـە ئـەم کەسـە، لـە ڕووی دەربڕینەوە کەمێک جیاواز بێت لە خۆت، بەڵام بەرهەمەکەی پڕ-بە-پێستی-خۆی {بـ}بێت.

---

[ئەتۆ فەیلەسووف نیت]

گرێکوێرەی دەروونی لەسەر فەلسەفە

کاتێک کە مرۆڤی فەلسەفی (فەیلەسووف) تووشی حاڵـەتێکی نـــــــــــــــاخۆش دەبێت؛ وەکـــــــــــــــــــــوو :- ماندووبوونی-بێئەنجام/شکان/دۆڕان/شکست. ئەوا دەکەوێتە دۆخێک کەوا هەست بەوە دەکات کەوا ئەو کەمـە؛ لـە ڕووی فەلسەفییەوە. لە ڕووی فەلسـەفییەوە دەستەوەسـتانە. ناگـات بــە هیچ. حاڵەتــە نەرێنییــەکانی ڕۆژانــە کاریگارییـان دەبێت لەســەر شـێوازی بیرکردنـەوەی فەیلەسـووفەکە. کاتێـک کـە ژیـــان مســـتەکۆڵەیەکت لێ دەدات، ئـــەوا دەکەویتــە نێــوان دۆخێـک کـەوا تەنانـەت فەلسـەفەش نـابێت بـە فڕیـادڕەس.

مـرۆڤ وا هەسـت دەكـات كـەوا لـەم دۆخـەدا، فەلسـەفە ناتوانێت وەڵام بداتەوە و هەوڵ بدات.

---

**[بوونێک لە سەروو کۆمەڵگا]**

{١-یاخییەکان، ١.١-سەرخێڵەکان، ١.٢-سەردۆستەکان}

١- یاخییەکانیش بەشێکن لـە کۆمـەڵگا، هەرهیچنـەبێت ئـەوان لە تەنیشت کۆمەڵگا خۆیان دەبینن. واتا ئەوان وەکوو دژێک لە هاوپەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵگادا خۆیان دەبینن. کۆمەڵگا لـە بەرامبەریانە و، ئەوانیش تیر و تـەنزیان تێ دەگرن. کـەواتا؛ ئەوانیش هەر بەشـێکن لـە کۆمـەڵگا و بـەبێ بـوونی کۆمـەڵگا ئـەوانیش بوونیـان نییـە. یاخییـەکان بـە هـەبوونی کۆمـەڵگاوە یاخین؛ کەواتا = یاخی نین.

١.١- سـەرخێڵەکان، سـەرخێڵ: ئـەو کەسـەی کـەوا خـۆی لـە سەروو کۆمەڵگا دەبینێت. وە {هەرگیزاوهەرگیز} ئامادە نییـە

ببێت بە بەشێک لە کۆمەڵگا. ئەوەش لەبەر چەند هۆکارێک :-

١) کۆمەڵگاکە خەساون.

٢) کۆمەڵگاکە چێژگەران.

٣) کۆمەڵگاکە بێ-ئامانجن.

٤) کۆمەڵگاکە خۆیان ناناسن.

٥) کۆمەڵگاکە درۆ لەگەڵ خۆیان دەکەن.

{لە-ئێستادا} ئەستەمە لەبۆ من کە خۆم وەکوو یاخییەکی کۆمەڵگا ببینم. چونکە هەروەکوو لە سەرەوە ئاماژەمان پێ دا؛ یاخییەکانیش بەشێکن لە کۆمەڵگا. هەڵبەتە با <درۆ-لەگەڵ-خۆماندا-نەکەین> و، دان بەو ڕاستییە دابنێین کەوا سەرخێڵیش بەشێکە لە کۆمەڵگا؛ بەڵام تەنها بە جەستە. واتا بە جەستە لەناویاندا دەژیەت. بەڵام بە هۆش، لە ئاستێکی تردایە، لە جیهانێکی تردایە؛ جیهانێک تایبەت بە خۆی.

<جیهانبینینێکی-تایبەت-بە-خۆی>. بەڵام لە <غەمێکی-نەبڕاوە>دایە لەبۆ کۆمەڵگاکەی. وەکوو چڵۆن باوکێک لە غەمی نەوەکانیدایە. ئا ئەمەیە سەرخێڵ.

---

**کاتێ وتە ڕووخا**

١. قسەوباسەکانمان

٢. قسەکردن چییە؟

٣. نووسین، پاشان قسە، سەرەتا نووسین، پاشان نووسین.

١.قسەوباسەکانمان

لێرەدا دەبینین کەوا زۆربەی قسەوباسەکانمان بەتاڵن. بەو واتایەی کەوا بەتاڵن لە ژیان. <بەتاڵبوون لە ژیان> بریتییە لە نەبوونی هەستێک لەبۆ ژیان. لەبۆ ژیانکردن و ژیانێکی باشتر. <هەوڵدانێک لەبۆ ژیانێکی باشتر/چاکتر>. ئەزموونی ڕابردوومان ئەوە دەردەخەن کەوا <قسەوقسەڵۆک> و

>باسکردنی مرۆڤەکان<، بێجگە لە زیاد/کاتکوشتن/خەساندنی-ئەقڵی، هیچ جۆرێک لە بەرهەم و ئامانجی نەبووە. کەواتا؛ لە باشترین حاڵەتدا، دەبێت قسەوباسەکانمان، بریتی بێت لە باسکردن/شیکارکردن/لێکۆڵینەوە لە بیرۆکەکان. چونکە ئەرکی سەرەکی >مێزی دانیشتن<، بریتییە لە قسەوباسێک لەسەر >بیرۆکەکان، ئایدیاکان<. چونکە باسکردن/شیکردنەوە/لێکدانەوەی ئایدیاکان، هەم بەچێژترە و هەمیش لەدوای ڕۆیشتن/بەجێهێشتنی دانیشتنەکە، ئارامییەک بەدەست دەهێنێت.

ئەمن هەندێکجار بێزار دەبم لە قسەوباسەکان/دانیشتنەکان/گفتوگۆکان. چونکە باس لە بابەتگەلێک دەکەن کەوا سەرنجم ڕاناکێشن و وەها هەست دەکەم کەوا بێسوودن. لەبۆوێنە:- ١)باسکردنی بابەتگەلێکی وەکوو مرۆڤەکانی تر و ئەوانی تر. ٢)باسکردنی بابەتگەلێک

کەوا ئەمن خۆم تێدا نابینمەوە. ئەگەرچی هەندێکجار لەگەڵ مرۆڤانی دەوروبەرم دواوم و قسەم کردووە سەبارەت بە بابەتگەلێک کەوا هەر لە بنەڕەتەوە حەزم پێیان نەکردووە، ئەوا لەبەر کەسی بەرامبەرم بووە کەوا پەرەم بە گفتوگۆکە داوە.

وە زۆرجاریش ویستوومە کەسی بەرامبەرم دڵخۆش بکەم، چونکە وەها هەستم کردووە/پێشبینیم کردووە کەوا ئەو پێویستی پێیەتی، بەڵام بە پێچەوانە بەسەرخۆمدا شکاوەتەوە. وە لەبۆم دەرکەوتووە، کەوا پێویست ناکات لەبۆ خەڵک/کەسەکان خۆت ماندوو بکەیت بە قسەوباس لەبۆ دڵخۆشکردنیان. زۆرجار کەسانێک ئەتۆیان خۆشدەوێت ئەگەر قسە بکەیت یاخود نەیکەیت. یاخود کەسانێک هەن کەوا بە بێدەنگی تۆیان خۆشدەوێت. کەواتا؛ دەبێت میانڕەو بین. وە پێویست ناکات خۆم بسەلمێنم لەبۆ

هیچ کەسێک لەسەر قسەوباسەکان و هەوڵ بدەم خەڵک دڵخۆش بکەم.

---

**[سوێند بە قەڵەم]**

نووسین چییە؟ ژانێک لە مەرەکەبدا. ئازارێک لە تاودانگەراییدا. نووسین ئەو ئازارەیە، کەوا تەواوی هۆشت مەست دەکات. نووسین بریتییە لەو چرکەساتەی، کەوا تیایدا خۆت لەدەست دەدەیت. وە دەبیت بە قەڵەم. دەبیت بە نووکی خامە. نووسین گەورەترین ترسم بووە و دڵنیاشم هەر بە گەورەترین ترسیشم دەمێنێتەوە. بەهای نووسین ئەوەندە لەلام گرینگە. کەوا لە چرکەساتی ئەکتی نووسین، هەمیشە بەخۆم دەڵێم:- ئەمە نووسین نییە. نووسین نابێت ئاوا لاواز بێت. نووسین نابێت ئاوا نەزانانە بێت. بەهایەکی ئەوەندە گەورەم لەبۆ نووسین داناوە، کە هەر دەبێت سوێندی پێ بخۆم. هەر دەبێت نووسین بڕیار لەسەر من

بـــدات. پێم بڵێت:- ئـــەتۆ هیچ نیت. ئـــەتۆ دۆڕاویت. ئـــەتۆ نەزانیت. هەرچی دەرپەڕاندنەکانی <پێوەری-نەرێنی> هەیە، دەرهاویشتەیەکی نووسینن لەبۆ ئەمن. کاتێک کە دەنووسـم، لە ڕاستیدا نامەوێت بنووسـم. نووسـین لـەبۆ من، کردەیـەکی مەترسیدارە. گەورەیەکی لەخۆم گەورەترە. دەزانم کە چەنـد خۆم بە گەورە بسەلمێنم، ئەوا هەمیشـە لـە ئاسـت نووسـیندا بچـــــــووکم. دەزانم کـــــــە چەنـــــــد دەقـــــــەکانم پاکسازی/پاکنووسی/تەکنیکی بن، ئەوا هەر لەلای من خـراپ و ناڕێک و شـێواون. چونکـە :- نووسـین هەوەنتەیـەک نییـە. نووسـین تـەنها کۆمـەڵێک پیتی لێکدراو و ڕسـتەی لێکدراو نییە. نووسـین تـەنها دەربڕینی بیروبـاوەڕ/ئەجێنـدا/فەلسـەفە نییە. نووسین بوونێکی مێتافیزیکی هەیە لەبۆ ئەمن.

نووسـین ئـەو بەرپرسـەیە کـەوا هـەر بـە تـەواوەتی لـێی دەترسـێم. نـاتوانم لـێی دەربـاز ببم. دەزانم کـەوا هـەرگیز نـاتوانم بـەرەنگار و بەرهەڵسـتی بکـەم. نـاتوانم نووسـین

کۆنترۆڵ بکەم و بەسەریدا زاڵ ببم. هەمیشە کێشەیەک هەیە، دەرەزێک هەیە. ناتەواوییەک هەیە. کەموکوڕییەک لە ئاستی سەرڕێژیدا. نووسین تاکە دەرمانی ئەمن بوو. وە هەر نووسینیش، تاکە دەردی ئەمن بوو. دەرد-و-دەرمان لەناو یەک خامەدا خۆیان دەبینییەوە لەبۆ ئەمن. کاتێک کە سوورِ دەزانم دەردێکم هەیە، ئەم قەڵەمە دەبێت بە دەرمانم. ئەم قەڵەمە تەواوی کێشی هۆشم هەڵدەگرێت. دەرپەڕاندنی تەواوی هۆشم لەناو نووکی قەڵەمدا. بوونێک لە قەڵەمدا. وە لە هەمان کاتیشدا، بەهێزترین ژانیش دەردەدات. چونکە نووسین پڕۆسێسێکە لە ئازار-و-شادی. کاتێک شادیت دەبێت بنووسیت هەتاوەکوو ئازار بچێژیت. وە کاتێک ئازارت هەیە، دەبێت بنووسیت هەتاوەکوو شاد بیت. ئەم هەموو لێکدژییە لەپای قەڵەمدا. ئەم هەموو تێهەڵکێشی و ئاوێتەبوونە، لە نووسیندا.

دەزانم چەنــدە توانــادار/چــاک {بـ}بم لــە نووســیندا، ئــەوا هەرگیز لـە ئاسـتی خـودی نووسـیندا نیم. نووسـین ئاسـتێکی تــرە، بەهایــەکی تــرە. نووســین لــە پلــەی باڵایــە. ئــەمن نووســینکاری ناکــەم. بەرهەڵســتی ئــەکتی نووســین ناکــەم. ئـەمن تـەنها، قەڵەمەکـە دەخەمـە سـەما. پەنجـەکانم، دەسـتم، خامەکـــە دەجـــووڵێنن و ئـــەملا-و-ئـــەولای پێ دەکـــەن. پرۆسێســێکی ســەماکەرانەیە. بــەڵام :- هــەرگیز ناگــات بــە ئاستی نووسین. وە هەرگیز ناتوانم پێی بڵێم نووسین.

نووسین لەبۆ من، بریتی بووە لە دەنگە نەبیستراوەکان. ئەو ئــازار و شــادیانەی کــەوا نەبیســتران. هەســتیان پێ نــەکرا. تێڕامانیـان لەســەر نــەکرا. هــەموو خۆیـان پــەنگ دەدەنــەوە لـەناو کۆمـەڵێک مەرەکەبدا. نووسـین تـەنها پیتـەکان نـەبوو، بڕگــەکان نــەبوو، وشــەکان نــەبوو، ئاڕاســتەکان نــەبوو. نووسـین میهرەبـان بـوو وەکـوو دایکێـک، تونـد بـوو وەکـوو باوکێک. نووسین پەروەردەکار بوو.

**کێ فەیلەسووفە؟ =** [میّتاگەرایی]

[ناچارگەرایی]

[بەرپرسیارگەرایی]

---

**[پەردەپۆشکردنی ڕاستگۆیی]**

ئایە هەرگیز لەخۆت پرسیوە کەوا؛ لەوانەیە درۆ لەگەڵ خۆتدا بکەیت؟ لێرەدا ئێمە پێویستە وەکوو تاکێک، ئەم پرسیارە لەخۆمان بکەین. کە ئاخۆ سەدا چەندی کردەکانیان/بیرولەبۆچوونەکانمان، هەر بەڕاستی گوتاری ناوەوەی ناخی خۆمانن یاخود لەبەر دەرەوەی ناوەوەی خۆمان ئەم پارچانەمان هەڵگرتووە؟

پەردەپۆشکردنی-ڕاستگۆیی لە ئاستی کۆئەندامی زاوزێ.

{جووتسیمیوولاکرا — نواندنلەبۆنواندن — ڕایزیۆمخاڵ —
فانتۆمی-پێویستنەبوون — <بوونێک-لەناو-شاشەکاندا>
— فیڵکردنی-ئاگایانە — دوگمەی-ڕاوەستاندن لەکوێیە؟}

پەردەپۆشکردنی-ڕاستگۆیی لە ئاستی ئارامییەت.

---

**[هەمان واتا بە چەمکێکی جیاواز]**

ئێمەی زانایان

ئێمەی فەیلەسووفان

هەموو شتێک لە <ئاو> پێک هاتووە.

[سیڕیبڕۆم]

بەرپەچدانەوەی ڕێژەگەرایی ڕەها

بیرکردنەوەی سەربەخۆ [بیرکردنەوەی سەربەخۆ وەکوو ئەلتەرناتیڤێک لەبۆ پەتای <بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە>]

لۆژیکی نالۆژیک

هۆش

[مێشک]

سەرڕێژی زانیاری

هەموو زانینێک بریتییە لە زانیاری.

بەڵام زانیاری بریتی نییە لە زانین.

چۆن زانین دەبێت بە زانیاری؟ ...

پێوەری چێژ

[دە،م]

[دڵ]

---

**<ڕێبازی-ڕۆمانتیک>، بکووژی <وزەی-کوردییەت>.**

{١- <ڕێبازی-ڕۆمانتیک> {لە دۆخی سنووربەزاندندا} ٢- لەبەرچی خۆکوژانەیە؟ ٣- ئەلتەرناتیڤ چییە؟ (هەیە)}

١- <ڕێبازی-ڕۆمانتیک> {لە دۆخی سنووربەزاندندا}

بێشک چەمکی <ڕێبازی-ڕۆمانتیک> سەرتاپاگیرییەکە بەسەر گشت "لق-و-پۆپ"ەکانی <"هونەر"،"ئەدەب"،"زانین"...>؛ <"هونەر"،"ئەدەب"،"زانین"...>گەلێک کەوا هاوپەیوەندن لەگەڵ کۆمەڵێک <دەرکەوتە> و <هاوپەیوەندی> خودی <دەرکەوتەی-میکانیکی>.

چەمکی <ڕێبازی-ڕۆمانتیک> {لە ئێستادا] خۆی بەرجەستە دەکات لەنێو کۆمەڵێک بنەما و ئاکسیۆمی <غەمگین-"دۆست">. ئاکسیۆمگەلێک لەپای خزمەتکردن بە <وزەی-تاریک>/<وزەی-نەرێنی>. وە سەرلەنوێ داڕێشتنەوەی "<پێوەرە-نەرێنییەکان>"، هیچی نەهێناوەتە سەر هونەری ژیان/تەختەی ژیان.

“ئێمە” [ئەگەر} سەیرێکی ئەو “بەرهەمە-هونەر”ییانەی ئێستا بکەین. ئەوا دەبینین هەر لە “گۆرانی/میووزیکا”، “تابلۆ/”نەخشونیگار””، پڕاوپڕن لە <وزەی-نەرێنی>. بەجۆرێک-لە-جۆرەکان <هەژمونی-نەرێنییەتی> و سەرڕێژی <پێوەرە-نەرێنییەکان> زاڵکردراون بەسەر هونەری ژیاندا.

<ڕێبازی-ڕۆمانتیک> خۆی دەبینێتەوە لە :- <بەزەیی-پێهاتن>، <ئاڵوودەی-غەم>، <خەساندنی-خود>، <خۆ-بەکەم-زانین>...

هەموو ئەو پێوەرانی کەوا لە خزمەتی <سەخاندنی-نێوخۆیی>ی <دەرکەوتەی-میکانیکی>ن، لەنێو ئەم ڕێبازە “هونەر”ییەدا بوونیان هەیە.

دوورنەڕۆین هەر تەنانەت ئەو “هونەرمەند”انەی کەوا پێشەنگن لەم بوارەدا، تەنانەت خودی خۆشیان {تەنانەت بەگوێرەی <پێوەری-خودی>خۆشیان] <دەرکەوتەیەکی-

میکانیکی> “دۆڕاو” و “ڕووخاو”ن. ئەوان لێوانلێوم لەنێو فەنتازیای-”سەرنەکەوتن”دا. {ئەم دەقە هەڵوێستێکی ئاد-هۆمینێمی نییە، بەڵام تەنها هەڵکەوتێکی ڕاستەقینەیە.] <ڕێبازی-ڕۆمانتیک> بریتییە لە پڕۆسێسێکی ڕاستەوخۆ-و-ناڕاستەوخۆی لەبەرگرتنەوەی غەم-و-ئازارەکان. وە تەنهاوتەنها سەروکاری لەگەڵ <غەم-و-ئازارەکان> هەیە. <ڕێبازی-ڕۆمانتیک> {هەرگیز} ناتوانێت <دەرکەوتەیەکی-میکانیکی> وەها بەرهەم بهێنێت کەوا سڵ نەکات لە هیچ هێز/پاڵنەر/ماددەیەکی دەرەوەی <دەرکەوتەی-میکانیکی>.

٢- لەبەرچی/چلۆن <ڕێبازی-ڕۆمانتیک> پڕۆسێسێکی <خۆکوژ>انەیە؟

کاتێک کە “ڕێبازێکی-هونەری” پابەندە بە کۆمەڵێک بنەماگەلی وەکوو :- <غەم-دۆست>ی، <ژان-دۆست>ی...

ئـەوا بێشـک بەرهـەم و ئەنجامەکەشـی هـەر هـەمان ئـەو بەرهەم و ئەنجامە دەبێت کەوا خـودی ڕێبازەکەی لەسـەردا چەسپێندراوە و "دامەزرا"وە.

٣- ئەلتەرناتیڤ {چییە/}هەیە؟

{ ئایـــە ڕێبـــازی-تاقیگـــەری ئەلتەرناتیڤـــە؟} ]ئایـــە ڕاپ ئەڵتەڕناتیڤە؟

{وزەی-توندییەت} — {وزەی-ڕێکخراوەیی}

پەردەپۆشکردنی ئاشتی

[کۆئەندامی زاوزێ]

کۆئەندامی-زاوزێ

{١- سیمیوولاکڕا-سەروو-سیمیوولاکڕا}

{٢- هێژێمۆنی-کار}

{٣- درۆکردن-لەگەڵ-خۆمان}

{٤- تاوانی-گەردوونی:- ڕاسپاردەی تۆڕەکان}

{٥- خەسێنەری-هۆش}

پۆڕنۆگرافی چییە؟

١- پۆڕنۆگرافیا چەمکێکی گشتگیرە بەسەر چەند لقوپۆپێک کەوا تیایدا کۆئەندامی زاوزێ دەبزوێنن. بەرهەمگەلێکی وەکوو <”هونەر”>.

[ئەپۆلۆ]

[بەرگری]

---

**[پێکەنینی هەتایی]**

ئەم گەردوونە و هەرچی لەنێویدایە، بێجگە لە پێکەنینێک هیچی تر نییە. خەندەیەکی بەردەوام، بە قاقایەکی بەرزی پێکەنینەوە بەستراوە ... — لەرەلەرەکان هەموو پێکەنینن. ڕووکەشەکان هەموو خەندەن. ئەم ژیانە، ئەم گەردوونە،

دەبێت تـــەنها پێکـــەنینێک بێت. ئەگـــەر ئێمـــە تۆزێـــک گوێچکەکانمان بکەینەوە، هەست بەم پێکەنینە دەکەین.

---

[ڕێچکەگۆڕینە پڕایمۆڕدیاڵەکان]

لە دایۆنایسزەوە لەبۆ ئەپۆلۆ

{لەڕێچکەلادانی پڕایمۆڕدیاڵی}

[ئەگەریـــەتی ڕاســـتبوون بـــەهۆی تاقیکردنـــەوەی زانستی]

---

ڕووکەشگەرایی لە پلەی باڵا:-

[ ئاڵفـــا-و-بێتـــا — خـــاکیبوون — ڕووکـــەش-لـــەکاتی-هیچنەبوون — چرکەساتە-چارەنووسسازەکان }

**پێوانەکردنی چێژ**

{پێوانەکردنی چێژ}

**١.** ئۆپۆڕاسیۆنە لۆژیکییەکان

٢. ئۆپۆڕاسیۆنە لۆژیکییەکان لە پڕاکتیکدا

٣.

٤.

٥.

٦.

١. ئۆپۆڕاسیۆنە لۆژیکییەکان :-

< ∓P > هاوواتایە بە :-

١) < P- > = "ئازار"

٢) < P+ > = "چێژ"

-

< T > هاوواتایە بە :-

١) < ST > = "كورتخايەن"

٢) < LT > = "درێژخايەن"

–

< ±H > هاوواتايە بە :–

١) < +H > = "تەندرووست"

٢) < –H > = "ناتەندرووست"

–

< ∓I > هاوواتايە بە :–

١) < +I > = "بەتين"

٢) < –I > = "بێتين"(ئاسايى)""

–

< P > هاوواتايە بە :–

١) < HP > = ئەگەريەتى ڕێژەبەرز

٢) < LP > = ئەگەريەتى ڕێژەنزم

٢. ئۆپۆڕاسیۆنە لۆژیکییەکان لە پڕاکتیکدا :–

---

**ئیوجێنیکەکەی ناو ئیوجێنیک:**

کاتێک کە هەندێک مرۆڤ بڕیار دەدەن کەوا ژیانێکی ئیوجێنیکی بەکردار بکەن. لەناو ئەو گرووپە، بێگومان کەسێک/گرووپێک هەڵدەستێتەوە و دەڵێت من ئیوجێنیکترم لە ئێوە. بەم شێوەیە ئیوجێنیک دەبێتە سیستەمێکی–کۆمەڵایەتی–لەناو–سووڕێکی–بێکۆتایی. کە بەردەوام گرووپێک یاخود کەسێک بە ئەوانی تر دەڵێت کە من ئیوجێنیکترم لە ئێوە.

---

**دیوەخانەکە (کورتەچیرۆکێکی نەبڕاوە)**

[١] دیوەخانی سەنگین.

دیوەخانەکـە لـە بەرزاییـەکی بێبنـدا خـۆی سـەنگین کردبـوو. ئەو لەوێ بوو. بە ئـارامی داچـەمابوو. چەقبەسـتوو بووبـوو. لـە ڕاسـتیدا، چەقبەسـتوویان کردبـوو. دیوەخانەکـە گـەلێک جیاواز دەرکەوتبوو لە چاو دیوەخانـەکانی تـردا. ئـەرێ! خـۆ ئەم دیوەخانە بە دیوەخانەکە ناسرا بوو. نـەوەکوو بـە وەهـا دیوەخانێک!

ئـەم دیوەخانـە گـەلێک جـوان بـوو. جوانییـەکی دیوەخـانی هـەبوو. هـەر کـە دەچوویتـە نـاوی هەسـتت دەکـرد گۆڕایت. چونکـە لـەناو ئـەم دیوەخانبوونـە هەوەنتەیـەک نـەبوو! وە هـەروەها وەهایـەکیش نـەبوو! بـیرم دێتن کـە باپیرم وەهـای لـــــــــــەبۆم بـــــــــــــاس دەکـــــــــــــرد:-

+ئەم دیوەخانە پێشئێمە درووسـت کـردراوە. باوکباپیرانمـان بـــە ســـینگی مانـــدووبوویان پێکیـــان هێنـــاوە. یـــەکێک لـــە پێکهێنەرەکانیش خۆم بووم. ئەرێ! خۆ وەهایە کە کەمم تێدا کـار کـرد، بـەڵام! مـنیش بەشـێک بـووم لـە پێکهێنـەرەکان!

باپیرم بەبەردەوامی خۆی بە دیوەخانەکەدا هەڵدەکێشا. وەکا ئەوەی کەوا داخوا چی بێتن! هەمیشە گاڵتەم بە گوتارەکانی دەهات سەبارەت بەم پاشکۆیە مێژووییە. بەڵام هەتاوەکوو نەمبینی، نەمزانی چلۆنە. وە ئەوەی بینیم، بەتەواوەتی درکی پێ کردم.

بەردەوامە ...



تاکێک دەبێت هەندێک کات خۆی بە بچووک بزانێت.

— عەلی ئەحمەد.

# چوارچێوەی بوون

[ناساندنی چەمکەکان]

ناساندنی چەمکی < چوارچێوەی بوون >

؛١؛ چەمکی < چوارچێوەی بوون >، بریتییە لە [کۆی] گشتی بوونێک/بوونەوەرێک، کە [پا]بەندە/لە پەیوەندیدایە بە [هەبوونی/بوونی] خۆی[، بەبێ هەبوونی تواناى دیاریکردنی هەڵبژاردەیەک لەبەردەستیدا، کە هەڵبژاردەیەک وەکوو: کە ئایە ئەو بوونە/بوونەوەرە هەڵبژاردەیەکی لەبەردەستە کە بتوانێت دەربچێت یاخود دەرنەچێت لە < چوارچێوەی بوون >ی خۆیدا ( لەبۆ ئەوەی بگات بە حەقیقەتێکی [ڕەها] لە سەروو چەمکی < چوارچێوەی بوون >دا بێت ) بێت و لە دەرەوەی < چوارچێوەی بوون >ی خۆی، جێگیر ببێت/دابمەزرێت؟ ( کە ئایە ئەم دەرچوونەش < چوارچێوەی بوون >ێکی تر بەرهەم دەهێنێتەوە یاخود نا و

[هەر لە هەمان < چوارچێوەی بوون>ی خۆیدا ئامادەگیری هەیە] بەڵکوو لەو کاتەدا، ئێمە کار لەسەر شتێکی تر دەکەین ( دەرچوون لە چەمکی < چوارچێوەی بوون >یش بریتییە لە هەبوونی بوون لەناو < چوارچێوەی بوون >ی خۆی ) )]، [ئەم بوونە/بوونەوەرە] بە هەبوونی خۆی لەناو < چوارچێوەی بوون >ی تایبەت بە خۆیدا، جێگیر بووە/چەسپێندراوە و، بەشداری دەکات لە هەبوونی خۆی لەناو < چوارچێوەی بوون >ی خۆیدا[.]

---

؛٢؛ < چوارچێوەی بوون >ی هەر بوونێک/بوونەوەرێک، بەبەردەوامی لەناو سووڕی خودئاماژە و هاوپەیوەندیبوون بە < دەرەوەی < چوارچێوەی بوون > > لەبۆ < چوارچێوەی بوون > و لەناو ستراکتۆرێکی/سیستەمێکی خودئاماژەیی هاوپەیوەندیدا چەقبەستووە و وابەستەیە/پەیوەندیدارە — هەروەها ئەم دایەلێکتیکە،

ناسـراوە بـە < دایـەلێکتیکی < چوارچێـوەی بـوون > و < دەرەوەی < چوارچێوەی بوون > > > — [.]

؛٢.٥؛ ئەگـەر ئێمـە مـرۆڤ وەک نموونـەیـەکی < چوارچێوەی بـوون>ی بهێنینـەوە، ئـەوە دەبیـنین کـە مـرۆڤ لـەناو < چوارچێوەی بوون >ی خۆیدایە بە هـۆی هـەبوونی چەنـدین ئـامرازی نـاوەکی وەک: فاکتـەرەکانی ...بـایۆلۆژی و دەروونی و... و ئـامرازی دەرەکی وەک: ...گـەردوون و جیهان و...[.] مرۆڤ لە هاوپەیوەندییەکدا ئامادەگیری هەیـە کـە ئـەو هاوپەیوەندییـە لـەنێوان < چوارچێـوەی بـوون >ی مرۆڤ و < دەرەوەی < چوارچێـوەی بـوون > >ی مرۆڤدا ئامادەگیرە[.]

---

؛٣؛ [هـەمیشـە] < چوارچێـوەی بـوون > لەگـەڵ چوارچێـوەی وە تەنها لەگەڵ چوارچێوەی خۆیدا — بنـەمای خۆیـەتی — (واتـا: < چوارچێـوەی بـوون >، < چوارچێـوە تـەنها

چوارچێوە >یە )، پەیوەندییەکی تەواوەتی هەیە و هەموو جۆرێک لە ئاڵوگۆڕکردنێکی پەیوەندیی [لە]نێوان < دەرەوەی < چوارچێوەی بوون > > و < چوارچێوەی بوون >، لە هەمئاهەنگییەکدا دان/دەبن[.] لە کاتێکدا کە < چوارچێوەی بوون > ئامادەگیری هەیە، لە هەمان کاتدا، < دەرەوەی < چوارچێوەی بوون > >یش ئامادەگیری هەیە، کە یەکێکیان ( لەبۆنموونە: < چوارچێوەی بوون > ) بەبێ ئەوەی تریان ( لەبۆ نموونە: < دەرەوەی < چوارچێوەی بوون > > ) بوونی نییە/ئامادەگیری نییە — بنەمایەکی هەمئاهەنگی/دایەلێکتیکی، ئامادەگیری هەیە/بوونی هەیە — [.]

---

دەرئەنجام:

{١} < چوارچێوەی بوون > = < چوارچێوە تەنها چوارچێوە >

{٢} < چوارچێوەی بوون > = < چوارچێوەی بوون >

{٣} < چوارچێوەی بوون > = مرۆڤ

بنەماکان:

{١} ئەمن [و ئەتۆ] لە <چوارچێوەی بوون >ی خۆمـ[اندا]دا، باسی < چوارچێوەی بوون > دەکـ[ێن]ەم.

ناساندنی چەمکی < دەرەوەی < چوارچێوەی بوون > > لە کاتی شیکردنەوە و ناساندنی چەمکی < چوارچێوەی بوون > یاخود چەمکێکی تری وەکوو چەمکی < دەرەوەی < چوارچێوەی بوون > > ( کە وا دیارە ئەم دوو چەمکە لە هاوپەیوەندییەکدان/دایەلێکتیکەکدان، لە کاتی سەرنجدان لەبۆ سەر یەکێک لە دوو چەمەکەکە )[.]

---

کە بەگوێرەی ئەوەی کەوا ئێمە لە سەرەتادا باس[کردن]ە سەرەکییەکەمان لەسەر < چوارچێوەی بوون > بوو، کە ئەم سەرەتا–شیکردنەوەیەی چەمکی < چوارچێوەی بوون

<ە، وامان لێ دەکات/دەمانخاتە ناو حاڵەتێک کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و ئۆتۆماتیکی ( هەرڕوودان ) سەرنجیش بهاوینە سەر چەمکی < ئەوە و ئەوانەی کە > چوارچێوەی بوون نین > > کە هەروەها ئەم چەمکە ناسراوە بە چەمکی < دەرەوەی < چوارچێوەی بوون > [.]<

---

< دەرەوەی < چوارچێوەی بوون > >، لە هەمان کاتدا بەشێکە لە < چوارچێوەی بوون > و بەشێک نییە لە > چوارچێوەی بوون >، ئەم دایەلێکتیکە بەناو لێکدژییە ( لێکدژ ناسراو )، لە سووڕێکی ئاماژە وەرگرتن لە > دەرەوەی < چوارچێوەی بوون > > لەبۆ ناو > چوارچێوەی بوون >ی بوونەوەرێکدا، جێگیر دەبێت هەتاوەکوو ماوەی کارکردنی/مانەوەی بوونەوەرەکە[.]

---

دەرئەنجام:

بنەماکان:

{١} < دەرەوەی < چوارچێوەی بوون > > لە دایەلێکتیکێکدایە لەگەڵ < چوارچێوەی بوون > ناساندنی چەمکی < زەمینە >

< چوارچێوەی بوون >ێک و < دەرەوەی < چوارچێوەی بوون >ێک، لەناو < زەمینە >[یەک]دا ئامادەگیری هەیە، < زەمینە > واتا ئەو پانتاییەی کە دەتواندرێت < دەرەوەی < چوارچێوەی بوون > > و < چوارچێوەی بوون >ی لەناو دابندرێت/بچەسپێندرێت[.]

< زەمینە > بریتییە لەو پانتاییەی کە تیایدا < دەرەوەی چوارچێوەی بوون > دادەندرێت/دەچەسپێندرێت لەناویدا/لەسەیدا[.]

---

[جیاوازکارییەکان و جوداکارییەکان]

چەمکی < ئیپیستەمێ >ی ( میشێل فۆکۆ ) و < چەمکی گۆڕانی پاڕادایم >ی ( تۆماس کوهن ) و چەمکی < چوارچێوەی بوون >

چەمکی < ئیپیستەمێ >ی ( میشێل فۆکۆ )، لەناو < چوارچێوەی بوون >دا جێی خۆی دەگرێت/مانیفێست دەبێت، نەوەکوو بە پێچەوانەوە بێت کە چەمکی < چوارچێوەی بوون > لەناو < ئیپیستەمێ >یەکدا جێگیر بووبێت/ئامادە بووبێت و تەنها لە < ئیپیستەمێ >یەک[ی دیاریکراودا]دا خۆی شاردبێتەوە و گەشە و سستبوون بکات، بەڵگە بەڵگەنەویستەکەشمان لەبۆ ئەم ئاڕگیۆمێنتە بەم شێوەیەیە: < چوارچێوەی بوون >ی مرۆڤ، < ئێپیستەمێ >ی دەچێتە سەر، بەڵام < چوارچێوەی بوون > ناچێتە سەر < ئێپیستەمێ >[.] < چوارچێوەی بوون > دەتوانێت خودئاگا بێت یاخود خودئاگا نەبێت[.]

دەرئەنجام:

< ئێپیستەمێ > => < ئیپیستەمێ > لەناو < چوارچێوەی بوون >

< چوارچێوەی بوون > =>**X** < ئیپیستەمێ > لەناو < چوارچێوەی بوون>

چونکە < چوارچێوەی بوون > پەیوەندی بە هەموو شتێکی [جەستەیی، دەروونی،...]مرۆڤ هەیە، بەڵام < ئیپیستەمێ > بەشێکە، لەناو/لەگەڵ < چوارچێوەی بوون >[.]

چوارچێوەی بوون و چوارچێوەی گشتی ( گەردوون )

چەمکی < مەیتریکس > و چەمکی < چوارچێوەی بوون >

< مەیتریکس > لەناو < زەمینە >یەکدا بوونی هەیە/ئامادەگیری هەیە[.]

< چوارچێوەی بوون > لەناو < مەیتریکس >ێکدا کە < مەیتریکس >ەکە لەناو < زەمینە >یەکدایە، ئامادەگیری هەیە[.]

هەر بوونێک لەنێو قەفەزەکەی خۆیەتی ... دەبێت جوانی بکەین.

— عەلی ئەحمەد.

# بەشی پانزدەیەم: درووستکراو و درووستکەر



چۆن گەردوونێک ئەگەر < درووستنەکراو و هەبووە > و < هەبووەی بێ درووستکەر > بووە، لەناو ئەو گەردوونەدا دەتواندرێت شت هەبێت کە < درووستکراوە >؟ لە کاتێکدا گەردوونەکە < هەبووەی بێ درووستکەر > بووە.

---

بیناکردنی < گەردوونێک بەبێ درووستکەر > لە زەیندا، شتێکی لۆژیکییە و ئاسانە لەبۆ کردن، دەتوانین چاوەکانمان

دابخەین و بیناکردنی گەردوونێک بکەین کە < دێتە بوون بەبێ دروووستکەرێک >، بەڵام لێرەدا کێشەیەک هەیە، ئەم بیناکردنە، خۆی جۆرێکە لە دروووستکردن، دروووستکردنی گەردوونێک کە < دێتە بوون بەبێ دروووستکەرێک > لە زەیندا.

---

هەبوونی مانای شتێک بەندە بە دروووستکەرەکە کە کاتێک دروووستکەرەکە شتێک دروووست دەکات، تەنها ئەو دەزانێت مانا و مەبەستی ئەو شتە چییە، چونکە خۆی دروووستی کردووە و لە خۆیەوە هاتووە.

---

دوو ڕەخنەی دوەین لەسەر نیتچە

< هەموو ڕاستییەک تەنها سەبجێکتیڤە >

< هەمووڕاستییەک کۆنتێکستواڵە >

< هیچ ڕاستییەک یوونیڤێرساڵ نییە >

ئەگـەر ئێمـە ئـەم دەسـتەواژەیە بـەکار بهێـنین کـە دەڵێت <
ڕاستی، بەگوێرەگەرایە > ئەوە

---

**[لاپەڕەکانی دەفتەر]**

؛١: ئەگەر گـەردوون هۆکـاری درووسـتبوونەکەی پەیوەنـدی هـەبووبێت بـە هـەبوونی درووسـتکەرێک کـەوا هەسـتی بـە [هـە}بـوونی خـۆی کـردووە، — واتـا ئـەم درووسـتکەرە بـە ویست و ئاگاداری خۆی گەردوونی درووست کردووە، واتا هۆشــی هــەبووە، درووســتکەرێکی نائاگـا نـەبووە، بــەڵکوو دەیـزانی چی دەکـات و چی ناکـات — کـەوا دەیـزانی چی دەکات، یاساکانی لـەبۆ گـەردوون داڕشـتووە، کـەواتا: لەبـەر ئەوەی کەوا ئەم درووستکەرە دەیزانی چی دەکات، هۆشدار بووە — درووستکەرێک نەبووە کـەوا نائاگـا و مـاددی بێت، بێگیان بێت — ئەمە مانای وایە کەوا ئێمەی مرۆڤ ناتوانین بڵێین کەوا هەرچی باشـە و خراپـە هەیـە، هـەرچی بیرۆکـە و

ڕا هەیە، هەموو تەنها بەلای مرۆڤەوە مانایان هەیە و هیچی تر نا، ئەمە خوێندنەوەیەکی هەڵەیە لەبۆ گەردوون چونکە: ئەگەر درووستکەری گەردوون بە ئاگا بێت و زیرەک بێت ( لێرەدا مەبەست لە زیرەکی واتا هەموو شتێک بزانێت ) یاسای دانابێت لەبۆ گەردوون ئەوا مانای وایە ئێمە دەبێت بە گوێی ئەم یاسایانە بکەین، چونکە درووستکەری گەردوون دایناوە، ئێمە ناتوانین لە دژی بوەستینەوە.

---

ئەگەر گەردوون بە هۆکارێکی ناعەقڵانە ( مەبەست لە ناعەقڵانە واتا ئاگاداری خودی خۆی نەبووە لە کاتی درووستکردنی گەردووندا، دەتوانین بڵێین مادده بووە، زیرەکی و خودئاگایی نەبووە ) هاتبێتە بوون، واتا خودئاگا نەبوون لە کاتی پرۆسەی درووستکردنی گەردوون، ئەوا ئەوکاتە دەتوانین بڵێین هەقیقەت و ڕاستییەکان درووستکراوی مرۆڤ

؛٢؛ و زیندەوەرن، و هیچ هەقیقەتێک، هیچ ڕاستییەک هیچ هەقیقەتێکی ڕەها بوونی نییە، ئەم کرداره ( بیرۆکەیە ) تەنها لەم کاتەدا ڕاستە ئەگەر > درووستکەری گەردوون یاخود ئەو هۆکارەی کە گەردوون لێوەی پەیدا بووە < خودئاگا نەبووبێت، واتا ( ئەم > درووستکەر یاخود ئەو هۆکارەی کە گەردوون لێوەی پەیدا بووە < ) “خۆی” نەیزانیوە بە چی کارێک هەڵدەستێت، (دەتوانین بڵێین ئەم > درووستکەر یاخود ئەو هۆکارەی کە گەردوون لێوەی پەیدا بووە <، بە دەرئەنجام و پڕۆسەی ئەم درووستکردنەی گەردوونی نەزانیوە، هەموو کار و پڕۆسەکەی لە خۆڕایی بووە،، “زیرەک” نەبووە، هەستی بە بوونی خۆی نەکردووە، بەڵکوو وەک پارچە بەردێک بێگیان بووە، وەکوو ئەو پارچە بەردەی کەوائاگاداری بوونی خۆی نییە، > درووستکەر یاخود ئەو هۆکارەی کە گەردوون لێوەی پەیدا بووە <،

ئەویش وەکوو ئەم پارچە بەردە، ئاگاداری بوونی خۆی نەبووە، تەواو بێگیان بووە ).

---

ئێستا ئێمە دوو سیناریۆمان لەبەردەست هەیە، یەکەم: ئەگەر < درووستکەر یاخود ئەو هۆکارەی کە گەردوون لێوەی پەیدابووە >، بەگیان ( خودئاگا ) بێت، ئەوا ئەو یاساکانی گەردوونی داناوە، کەواتە تەنها یەک هەقیقەتی ڕەها بوونی هەیە، ئەویش بریتییە لە دیدی ئەم درووستکەرە لەبۆ گەردوون، یاخود چونکە ئەو یاساکانی یاساکانی گەردوونی داناوە کەواتا هەقیقەت و ڕاستییەکان درووستکراوی زیندەوەر و مرۆڤ نین بەڵکوو یاسای گەردوونە، لێرەدا هەقیقەت بەرجەستە دەبێت لە دیدی ئەم درووستکەرەی گەردووندا.

---

؛٣: لــێرەدا فەلســـەفە پرســـیار دەکـــات و زانســـتیش وەڵام دەدات، لـــەبۆ بـــە درۆخســـتنەوە یـــاخود ڕاستخســـتنەوەی سیناریۆی ئەوەی کەوا ئـەم گەردوونـە درووسـتکەری هەیـە یاخود نا، پێویستمان بە زانستە ( پێویستمان بە بەکارهێنانی شـێوازی پڕاکتیکییـەکان هەیـە )وەکـوو: فیزیـا!، بیرکـاری!، بیرکردنەوە! )، لێرەدا پێویستە جەخت لەسەر ئەوە بکەینەوە کـەوا بـەبێ بـەکارهێنانی ڕێگـای پڕاکتیکی لـەبۆ دۆزینـەوەی ئەوەی ئایە کەوا گەردوون درووستکراوی هەیە، ناگـەین بـە هیچ دەرئــەنجامێک و ئامانجێــک، چونکــە بیرکردنــەوە لــە شتەکان تەنها و تاکە ڕێگا نییە لەبۆ زانینی شتێک کە ڕاستە یـاخود ناڕاسـتە، پێویستیشـمان بـە کـردەکیش ( پڕاکـتیکی ) هەیە، — لێرەدا فەلسەفە دەبێتـە پڕاگمـاتیکی — زانسـت بـە یارمـــەتی فەلســـەفە، پێشـــدەکەوێت — فەلســـەفە پرســـیار دەکـات، زانسـت وەڵام دەدات — هەنـدێک کـات پرسـیاری گرینــگ پرســـیار ناکـــەن، کێشـــەکەش لێرەدایـــە — ئێمـــە

نامانەوێت بە هۆی فیزیا و کیمیا و ڕەهەندەکانی زانست بە دوای ڕەچەڵەکی درووستبوونی گەردووندا تێبکۆشین: کەوا بێگومان پرسیاری سەرهەڵدانی گەردوون و ڕەچەڵەک و شووناسی هەموو "ماددەکان" گرینگترین پرسیارە، زانست و فەلسەفە لەبۆ ئەم پرسیارانە دەژین.

---

ئێمە هیواداریین بە هۆی بەرەوپێشچوونی لێکۆڵینەوەکان لە "ماددە"/"گەردیلە" کوانتۆمییەکان، بگەین بە دەرئەنجام لە دۆزینەوەی هۆکاری درووستبوونی گەردوون، — مانای، یاخود تێگەیشتن لە هەموو شتەکان بە گشتی —.

---

؛٤؛ لێرەدا ئێمە وەڵامی ئەو پرسیارەمان پێدەگات کەوا دەڵێت: ئایە ئەخلاق و بەهاکان درووستکراوی مرۆڤن یاخود نەخێر. بە هۆی گەڕانمان بە شێوەیەکی زانستییانە ( بە مانای زانستییانە مەبەستم فیزیا و هەوڵدانی

کردارەکییە نەوەک تەنها بیرکردنەوە، بەڵکوو کردارەکیش، پڕاگماتیـک ) بـەدوای بنچینـە ( ڕەچەڵـەک ) و هۆکـاری درووسـتبوونی گـەردوون، لـە دوای هەوڵـدان و گـەڕانمان ئەگـەر بەڵگـەکان لەبەردەسـتمان بـوون ئینجـا دەزانین ( لـەبۆمان دەردەکـەوێت ) کـەوا ئەگـەری هـەبوونی بـەها، بوونی هەیە.

---

بـەڵام نـابێت ئاوەهـا بـە ئاسـانی و بـە چـاوێکی سـاویلکانە سـەیری ئـەم دۆزراوانـەی زانسـت بکـەین — چونکـە لـە دەستکەوتنی هەر دەرئـەنجامێکی زانسـتی دەبێت دوو، سـێ، بەڵکوو بگرە سەد، هەزاران جـار دووبـارە چاوپێداخشـانەوە لەبۆ ئـەم دۆزراوە زانستییە بکرێت، چونکـە: ئەگـەری هەڵـە، هەمیشە بوونی زۆرە —

---

— خــــودا هەقیقــــەتی تـــەواوە. هەقیقـــەت خودایـــە. هیچ بوونـەوەرێک نـاتوانێت هەقیقـەتی تـەواوەتی ببینێت. هـەموو بوونـــەوەرێک بـــە جۆرێــک لـــە هەقیقـــەت تێــدەگات کـــەوا پەیوەنـدی و پێکهـاتنی جەسـتەکەی، بـە جۆرێـک هەقیقـەت دەبینێت چونکـە جەسـتەی، ڕادەی توانـای بینینی هەقیقـەتی پەیوەندی بە پێکهاتە جەستەییەکانی ئەم بوونـەوەرە هەیـە. ( لەبۆ نموونە: بوونەوەرێک جیهان بـە شـێوەی ڕەنگی سـوور دەبینێت، چونکە ئاوەها بەمشێوەیە هاتووەتە ڕێگا کـەوا ئـەم بوونەوەرە ئـەم بوونـەوەرە هەقیقـەت بـە سـوور تێدەگات و نـازانێت کـەوا ڕەنگی تـریش بوونیـان هەیـە، ) کـەواتا هــەر بوونەوەرێک بە شێوازێک

---

؛٥؛ هەقیقەت دەبینێت. بوونـەوەرەکانیش کڕایتێریایـان هەیـە، ئــەم کڕایتێریایانــەیان هۆکــاری ئــەوەن کــەوا هەقیقــەت بــە جیاوازی ببینن، بـەڵام لـە لای خـودا، هەقیقـەت هیچ فلتـەرێک

و پەردەیەکی لەسەر نییە. تەنها خودا دەتوانێت هەقیقەت بەبێ فلتەر و پەردە، ببینێت. ڕێگر بوونیان هەیە لە بەردەم بوونەوەران لەبۆ بینینی هەقیقەتی تەواو، مرۆڤ ناتوانێت جاوی وەکوو تەلیسکۆب لێ بکات و ڕوو بچێتە نێو تەنۆلکەکان و ببینێت کەوا هەموو شتێک لە شتانێکی وردیلەتر پێکهاتوون ( لە ڕاستیدا مرۆڤ دەتوانێت ئەم کارە بکات بەڵام بە یارمەتی تەکنەلۆژیا بەڵام مەبەستەکەم ئەمە نییە، مەبەستەکەم ئەمەیە: کەوا بوونەوەرەکان هەر یەکێکیان توانایەک کەمتر یان زیاتر، بەهێزتر یان لاوازتر، لە یەکێکی تری هەیە، بەهۆی ئەم جیاوازییە، ناتوانن هەقیقەتی تەواوەتی ببینن، هەقیقەتی خودا ). بەڵام لەلای خودا، ئەم لاواز و بەهێضیانە بوونیان نییە، چونکە خودا دەتوانێت " هەموو شتێک بکات" خودا ( ئۆمنیپڕێسنت ) و ( ئۆمنیپۆتێنس )ـە.

---

**[ئەم پارچە دەقە سەداسەد ڕاستە] = ڕاستی بەڵگەنەویست**

لـێرە دا لـەبۆمان بەدەردەکـەوێت کـەوا لـە بینیـنی هەقیقـەت، جیـاوازبینی هەیـە لـە نێوان زینـدەوەران. ئـەم جیاوازبینییـە پێکهاتـــــەی بایۆلۆژییــــان هۆکارەکەیــــەتی — بەڵگـــــە: مایکرۆزیندەوەرەکان زۆر سادەترن ( پێکهاتەی بایۆلۆژییان ئـاڵۆز نییـە وەکـوو مـرۆڤ ) لـە مـرۆڤ، مـرۆڤ پێکهاتـەی بایۆلۆژی زیـاترە، بـەراوردێکی نێوانیـان بکـە، بینیـنی جیهـان لەلای هەر یەکەیان جیاوازە، دووبارە هەر دەگەڕێتەوە سەر پێکهاتەی بایۆلۆژی.

---

؛٦؛ لە گەردووندا ( لە ژیاندا ) چەنـدین ئاسـتی بیـنین بـوونی هەیـە ئاسـت لـێرەدا مەبەسـت لەوەیـە کـەوا چەنـدین ئاسـت هەیە لەبۆ بینینی گەردوون، گەردوون دەتواندرێت ببیندرێت بە تەلیسکۆب بە تەلیسکۆب دەتوانین بچووکترین شتەکان و دوورتـرین و گـەورەترین شـتەکانی نێـو گـەردوون ببیـنین،

ئاستی ژێرەوەی گەردوون ( ئاستی بنەڕەتی کەوا هەموو شتێکی بیندراو وەکوو خانوو و بلۆک و کەلوپەل لەو درووست بووە، لەو پێکهاتووە ) لە ئاستی ژێرەوەی گەردوون ئەتۆم و بچووکتر لە ئەتۆم بوونیان هەیە، ئاستێکیتر خۆمانین: ئێمەی مرۆڤ کەوا ناتوانین ئاستی ژێرەوەی گەردوون ببینین و ناتوانین بە چاوەکانمان پێکهاتە بنەڕەتییەکانی گەردوون ببینین، لە ئێرەش کە هەروەک چۆن ئێمە ئاستی پێکهاتنی گەردوونمان ( مەبەستم ئاستی یەکەمە: تەنۆلکەکان ) لەلاوە بچووکە، بەم شێوەیەش ئاستی گەردوونی تر بوونیان هەیە کەوا زۆرتر لە ئێمە گەورەترن. بچووکی و گەورەیی قەبارەکان بوونیان هەیە لە گەردوون.

---

گەردوون فرە ڕەهەندە ئاستە، ئەگەر بەو پێیەی کەوا لە خۆمان بچووکتر و گەورەتر بوونی هەیە، ئایە دەبێت

گـەردوونیش لـە خـودی گـەردوون خـۆی گـەورەتر بـوونی نەبێت؟ ...

---

فـرە ڕەهەنـدی گـەردوون : نزیـک لـە بێسـنووربوون بـەڵام خودی بێسنووربوون نییە ...

---

؛٧؛ شــتێک نــاتوانێت لــە خــودی خــۆی بکۆڵێتــەوە بــەبێ هــەبوونی شــتێک هاوشــێوەی خــۆی ( نەموونــە: مرۆڤێـک ناتوانێت بە تەنها لە خودی خۆی بکۆڵێتـەوە بـەبێ هـەبوونی مرۆڤێــک وەکــوو خــۆی لــە بــەر دەمی، چونکــە هەنــدێک لێکۆڵینەوە پێویستی بە زیاد لە یەک مرۆڤ هەیە. )

چەمکەکان:

دروستبوون چییە؟

دروستکەر چییە؟

هیچ چییە؟

---

دروستکەری یەکەم (درووستکەر)

دروستکەری دووەم (پێکهێنەری خودئاگا)

دروستکەری سێیەم (ئـامێر، بەرنامـەڕێژکردراو، پێکهێنـەری ناخودئاگا)

---

زەمینە

بوون، نەبوون، نابوون, درووسـتبوون لـەناو نـابوون دەبێت بە بوون

-نابوون دەرەوەی گەردوونە

-نـەبوون تـەنها لـەناو بـوون، بـوونی هەیـە. ئەگـەر نـابوون لەناو بوون ببێت، ئەوە دەبێتە نەبوون، نابوون لـەناو بـوون، بوونی نییە.

بوون لەناو نابووندا

-

ئاستەکان، گۆشەنیگایەکان

ڕاستی تەواوەتی، بە گوێرەی درووستکەری یەکەم

ڕاستی تەواوەتی، بە گوێرەی درووستکەری دووەم

ڕاستی تەواوەتی بە گوێرەی درووستکەری سێیەم

---

زانستی پێناسەکاری

زانستی لۆژیکی نالۆژیک زانستی < ئەگەر ڕاست نییە، ئەدی کوو قسەکە گۆترا؟>

زانستی مێتافیزیکای کەسی یەکەم

---

تەکنیکی: یەک وێنەیی، گەورەکردن، بچووککردن

شتێک لە هیچەوە دێتە بوون بە یەک وێنەیی (**Frame By Frame**)

شتێک لە هیچەوە دێتە بوون بە گەورەکردن (گەورەبوون، گەشەکردن)

شتێک لە هیچەوە دێتە بوون بە بچووککردن (بچووکبوون، پووکانەوە)

درووستبوون وەک هاتنەبوونی کات (شتێک دێتە بوون، بە هۆی

---

سەرەتا دەبێت <زەمینە> هەبێت بۆ دانانی <بوون> و <نەبوون> لەناو <زەمینە>دا

---

١. چەمکی <زەمینە> وەک فەرشێک بۆ دانانی <نابوون> یاخود <بوون - نەبوون> لەناویدا

٢. <نابوون> وەک <زەمینە> بۆ دانانی <بوون – نەبوون> تێی دا

٣. کاتیگۆری <بوون – نەبوون> و کاتیگۆری <نابوون>

٤. <نەبوون> بریتییە لە نەمان یاخود نەبوونی شتێک لە شوێنێکدا، <نەبوون> واتا نەمان و نەبوونی <بوون>

٥. ؟؟؟

---

دەبێت دووبـــارە، وشـــەکان و پێناســـەکانیان، دەستنیشـــان بکردرێنەوە

چونکە بەکارهێنانە عامییەکەیان غەڵەتە

- پاڕافڕەیزێکی عیرفان مستەفا

---

چەمکەکان:

درووستبوون چییە؟

درووستکەر چییە؟

هیچ چییە؟

---

دروستکەری یەکەم (درووستکەر)

دروستکەری دووەم (پێکهێنەری خودئاگا)

دروستکەری سێیەم (ئـامێر، بەرنامـەڕێژکردراو، پێکهێنـەری ناخودئاگا)

---

زەمینە

بوون، نەبوون، نابوون, درووسـتبوون لـەناو نـابوون دەبێت بە بوون

–نابوون دەرەوەی گەردوونە

–نـەبوون تـەنها لـەناو بـوون، بـوونی هەیـە. ئەگـەر نـابوون لەناو بوون ببێت، ئەوە دەبێتە نەبوون، نابوون لـەناو بـوون، بوونی نییە.

بوون لەناو نابووندا

---

ئاستەکان، گۆشەنیگایەکان

ڕاستی تەواوەتی، بە گوێرەی درووستکەری یەکەم

ڕاستی تەواوەتی، بە گوێرەی درووستکەری دووەم

---

زانستی پێناسەکاری :

درووستبوون چییە؟

درووستبوون وەک هاتنەبوون. (شتێک کە لە هیچەوە، بێتە بوون)

نموونە: (ژوورەکە بەتاڵ بوو، پاشان شتێک لە ژوورەکە درووستبوو)

نموونە: ( هیچ => شت)

نموونە: (      <= **S**)

---

تەکنیکی: یەک وێنەیی، گەورەکردن، بچووککردن

شتێک لە هیچەوە دێتە بوون بە یەک وێنەیی (**Frame By Frame**)

شتێک لە هیچەوە دێتە بوون بە گەورەکردن (گەورەبوون، گەشەکردن)

شتێک لە هیچەوە دێتە بوون بە بچووککردن (بچووکبوون، پووکانەوە)

درووستبوون وەک هاتنەبوونی کات (شتێک دێتە بوون، بە هۆی

---

سەرەتا دەبێت <زەمینە> هەبێت بۆ دانانی <بوون> و <نەبوون> لەناو <زەمینە>دا

---

١. چەمکی <زەمینە> وەک فەرشێک بۆ دانانی <نابوون> یاخود <بوون - نەبوون> لەناویدا

٢. <نابوون> وەک <زەمینە> بۆ دانانی <بوون – نەبوون> تێی دا

٣. کاتیگۆری <بوون – نەبوون> و کاتیگۆری <نابوون>

٤. <نـەبوون> بریتییـە لـە نـەمان یـاخود نـەبوونی شـتێک لـە شوێنێکدا، <نەبوون> واتا نەمان و نەبوونی <بوون>

٥. ؟؟؟



# بەشی شانزدەیەم: دڵێک لە گەردوون



سەردەمانێک، لە گەلەئەستێرەیەکی دووردا، دڵێک هەبووە کە بەقەد خودی گەردوون فراوان بووە. ئەم دڵە نائاساییە بە خۆشەویستی و بەزەیی و هاوسۆزی بێ سنوورەوە دەلەرزی و گەرمی و خێرخوازی خۆی بۆ هەموو گۆشەیەکی گەردوون دەردەپەڕاند.

دەگوترا ئەم دڵە سەرچاوەی هەموو خۆشەویستییەک بووە لە گەردووندا، هەموو زیندەوەران بە پەیوەندییەکی قووڵ و نەشکاوەوە بەیەکەوە دەبەستێتەوە. وزەکەی گەیشتە دەرەوەی سنوورە فیزیاییەکان، فەزا و کاتی تێپەڕاند. ئەم دڵە دەستی لە دڵی ئەستێرە و هەسارەکان و گەلەئەستێرەکان دا و تابلۆیەکی پەیوەندی بەیەکەوە بونیاد کرد کە فراوانییەکی بەرفراوانی گەردوونی گرتەوە.

لەناو ئەم دڵەدا، گەلەئەستێرەکان بە وردبینییەکی ناسکەوە لە باوەش دەگیران و سیحرەکان لە باوەشێکی پەروەردەکارانەدا جێگیر بوون ... خەون و هیوا و ئاواتەکانی بوونەوەرە بێشومارەکانی لەخۆ دەگرت و دەیخواردەوە ... ڕێنماییان دەکرد لە گەشتەکانیاندا بەناو ژیاندا ... هەسارەکان لە ژێر کاریگەری پەروەردەکردنیدا گەشەیان کرد، لەگەڵ پەرەسەندن و گەشەکردندا ... بەرەو ئاسۆ نیشتنەوە.

ئەم دڵەی گەردوون تەنها بەخشەری خۆشەویستی نەبوو بەڵکوو وەرگریش بوو. — ئازار و خەم و ژانەکانی هەموو بوونەوەرەکانی هەڵ دەمژی و گۆڕی بۆ بەزەیی بێ سنوور .. — تێگەیشتن لەو ململانێ و سەختییانەی ڕووبەڕووی تاکەکان دەبنەوە ... دڵنەوایی و تێگەیشتنی پێشکەش بەو کەسانە دەکرد کە پێویستیانە و ئەوانەشی کە پێویستییان نییە ...

هەرچەندەی گەردوون فراوان دەبوو، ئەم دڵە شانبەشانی ئەمیش فراوانتر دەبوو ... جیهان و شارستانییەتە نوێیەکانی دەباوەش ئەگرت ... ئەو جوانی لە فرەچەشنییدا ناسی و ئاهەنگی هەمئاهەنگی بە هەموو تاکێک دەگێڕا .. ئەو یەکگرتوویی لە نێوان هەموو بوونەوەرەکاندا بەرەوپێش دەبرد ...

<خۆشەویستی دڵ> پێویستی بە یاساکانی فیزیا نەبوو ... ڕەهەندەکانی تێدەپەڕاند ... ئەو دەنگی دەدایەوە لەگەڵ لەرزینەکانی خۆشەویستی لە سەرانسەری گەردوونگەلەکاندا ... چ چرایەکی ئومێدبەخش بوو ... — تەنانەت لە تاریکترین گۆشەکانی بوونیشدا بە گەشاوە دەدرەوشایەوە ... بە هەمووانی دەگوتەوە خۆشەویستی ئەو هێزە ئەبەدییە کە هەموو شتێکی بەیەکەوە بەستووەتەوە.

بۆ مرۆڤان گەڕان بەدوای جەوهەرەکەیدا چالاکییەکی پێویست بوو ... وەک بیرخستنەوەیەک بوو ... خۆشەویستی ئەو هێزە ئەبەدییەیە کە دەتوانێت هەموو تاریکییەکان داگیر بکات و هەموو برینەکانیش سارێژ بکات ...

لە بەردەوامی بەرفراوانبوونی گەردووندا گەلەئەستێرەکان سەمایان دەکرد و هۆزی هەسارەکان دەخولانەوە بە

دەوریــدا ... دڵ بــە شــێوەیەکی بــەردەوام ترپــەی دەدا و هۆرەی ژیان دەنگی دەدایەوە بەسەر ئەواندا ... چرپەی بۆ هەموویان دەکرد ... ئەو دڵە هانیانی دەدا خۆشەویستی لە بــاوەش بگــرن و میهرەبــانی بڵاوبکەنــەوە و ئــەو وزانــە پەروەردە بکەن کە دەیانبەستنەوە.



و بــەم شــێوەیە بــوو کــە دڵی گــەورە هــەر وەک چــۆن گــەردوون بــەردەوام بــوو لــە لێــدان ... گــەردوونی بــە خۆشەویستی خۆیەوە بەڕێوە دەبرد ... — بۆ هەمیشە ئەو

وای دەکرد ... وە چارەنووسی هەموو پـەروەردەکراوەکانی بەرەو داهاتوویەکی پڕ لە بەزەیی و میهرەبانی ڕاپێچ دەکرد ...

**کۆتایی ...**

با دڵمان وەک گەردوون بێت ... کە ئەزانم ئەستەم نییە.

عەلی ئەحمەد.

# سەرچاوە و پەڕاوێزەکان

**بەشی شیعر:**

ئـــەم شـــیعرەم لـــە پـــەڕتووکی (Night Breaker: Fragments From the Post-philosophical Landscape) بە زمانی ئینگلیزی داناوەتەوە بە کەمێک دەستکارییەوە. بەڵام دەقە ئەسڵە کوردییەکە لەم پەڕتووکەی بەردەم خوێنەر دایە.

دەقە کۆنەکە بە ئینگلیزی لەم پەڕتووکەدایە.

Ali Ahmad - Night Breaker: Fragments From the Post-philosophical Landscape – 2023

---

**بەشی یەکەم :** ئەم بەشە لە شێوەی پەخشانە. وە دەبێتە ئەوتۆبایۆگرافیاش (autobiography) — کە تیایدا باسی تێڕوانینی خۆم دەکەم سەبارەت بە ژیان بە گشتی.

**بەشی دووەم:**

## Algorithm

ئەلگۆریتم یاخود ئالگۆریتم، بریتییە لە ڕێکارێکی هەنگاو بە هەنگاو یان کۆمەڵێک ڕێنمایی کە بۆ چارەسەرکردنی کێشەیەکی دیاریکراو یان ئەنجامدانی ئەرکێکی دیاریکراو داڕێژبێت. ئالگۆریتم بریتییە لە زنجیرەیەکی پێناسەکراوی کردارەکان کە دەتوانرێت لەلایەن کۆمپیوتەرێک یان کەسێکەوە جێبەجێ بکرێت بۆ بەدەستهێنانی دەرئەنجامێکی خوازراو. ئەلگۆریتمەکان لە بوارە جیاوازەکاندا بەکاردەهێنرێن، لەوانە زانستی کۆمپیوتەر، بیرکاری و ژیانی ڕۆژانە، بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکان بە شێوەیەکی کارا و بەردەوام. ئەوان چەمکێکی بنەڕەتین لە جیهانی کۆمپیوتەردا و بۆ ئەرکەکانی وەک ڕیزکردنی داتا و گەڕان بەدوای زانیاری و بڕیاردان.

## Algorithm of Evil — ئەڵگۆڕیتمی خراپەکاری

دەســـتەواژەی "ئـــەڵگۆڕیتمی خراپـــەکاری" لـــە ڕاســـتیدا زاراوەیەکی ستاندارد نییە لە زانستی کۆمپیوتەر یان هەر بوارێکی دیاریکراودا ... — بەڵوو چەمکێکی ئەبستراکتتر و مێتـافۆریکترە ... کـە ئامـاژە بـە بیرۆکـەی بـەکارهێنانی ئەلگۆریتمـەکان دەکـات بـۆ ئەنجامـدانی ئەرکـەکان، بـە شـێوەیەک کـە دەرئەنجامگـەلێکی زیانبـەخش و نائـەخلاقی هـەبێت. — لـە سـیاقێکی فراوانـتردا پەیوەسـت دەبێت بـە خـراپ بـەکارهێنانی ئامڕازەکـانی تەکنـەلۆژیا. وەکـوو: ئەلگۆریتمـەکانی سۆشـیال میـدیا، یـان سیسـتەمی داتـای گـەورە [Big Data] بـۆ مەبەسـتی زیانبـەخش. وەکـوو بڵاوکردنەوەی زانیاری هەڵە، داگیرکردنی ناڕاستەوخۆ، یان دەستکاریکردنی ڕەفتاری بینەران و بەکاربەران

## Stimulants

وزەبەخشــەکان یــاخود هانــدەرەکان پــۆلێکن لــە مــاددە دەروونییــە چالاکــەکان کــە کاتێــک دەخــورێن، وریــایی و ســـەرنج و وزە زیـــاد دەکـــەن و بـــاری دەروونی بـــەرز دەکەنەوە. — نموونەی باوی هاندەرەکان بریتین لە کافـاین، نیکۆتین، ئەمفیتامینەکان (بۆ نموونە، ئـەدرەل Adderall)، و میتیلفینیـدات (بـۆ نموونـە، ڕیتـالین Ritalin). زۆرجـار ئـەم ماددانـە بـۆ بەرەنگاربوونـەوەی ماندویـەتی و تیژکردنـەوەی تــەرکیز و یــان بــۆ باشــترکردنی ئــەدای مــەعریفی بــەکار دەهێنرێن.

---

**بەشی سێیەم:**

## Accelerationism

خێراگـەرایی تیـۆرێکی فەلسـەفی و سیاسـییە کـە پێشـنیاری ئــەوە دەکــات کــە تاکــەکان یــان گرووپــەکان بــۆ هێنانــەدی گۆڕانکارییەکی کۆمەڵایـەتی-سیاسـی خـوازراو، پێویسـتە بـە

ئەنقەست ئەو پرۆسە یان بارودۆخ و پرۆسانە چڕتر بکەنەوە کە بەشدارن لە ڕووخان یان گۆڕینی سیستەمی بەرچاو ... — خێراکەران بە شێوەیەکی گشتی پێیان وایە کە بە پاڵنانی ئەم پرۆسانە بۆ سنوورە دوورەکانی خۆیان، دەتوانن دارمانی سیستەمی ئێستا تاو پێ بدەن و ڕێگە بۆ سیستەمێکی نوێ و خوازراوتر خۆش بکەن. — لێکدانەوە و گۆڕانکاری جیاواز بۆ ئەم چەمکە هەیە، هەندێکیان پەیوەستن بە ئایدۆلۆژیای چەپ یان ڕاست ... ڕەخنەگران دەڵێن خێراکردنی پرسەکان یان سیستەمەکانی ئێستا ناسەقامگیری، نایەکسانی، یان تێکچوونی کۆمەڵایەتی بەرپا دەکات و لەبەر ئەوە لە ڕووتەختی کردەکاندا ئەم دەستەواژەیە سوودی نییە.

**Gilles Deleuze — Félix Guattari**

جیل دێلۆز و فێلیکس گواتاری دوو فەیلەسوف و بیرمەندی کاریگەری فەرەنسی بوون کە بە کارە هاوبەشەکانیان لە بوارەکانی فەلسەفە و دەروونشیکاری و پۆست-بونیادگەرایی ناسراون. بیرۆکەکانیان کاریگەرییەکی بەرچاویان لەسەر بوارە جیاوازەکان هەبووە، لەوانە فەلسەفە، لێکۆڵینەوەی کولتووری و تیۆری ئەدەبی. — ئەوان بە بەرهەمە هاوبەشەکانیان ناسراون، دیارترینیان "سەرمایەداری و شیزۆفرینیا"یە، کە هەردوو کتێبی "دژە ئۆدیپ" و "هەزار گرد" لە خۆ دەگرێت.

## Nick Land

نیک لاند فەیلەسوف و نووسەرێکی بەریتانییە و بە پەیوەندی لەگەڵ هەندێک بزووتنەوەی فەلسەفی و کولتووریدا ناسراوە، بەتایبەتی فەلسەفەی خێراگەرایی و یەکەی توێژینەوەی کولتووری سایبرنێتیک (CCRU). —

لـــە ســـاڵانی نەوەدەکانـــدا وەک لایـــەنگری خێراگـــەرایی ناوبـــانگێکی بـــەرزی بەدەســـت هێنـــا. زۆرجـــار کارەکـــانی توخمـــەکانی فەلســـەفەی کۆنتینێنتـــاڵ [continental ] و ســـــایبەرنێتیک [cybernetics] و خـــــەیاڵی زانســـــتی [ science fiction] تێکەڵ بە یەکتری دەکات.

لیستی گشت سەرچاوەکانی بەشی سێیەم:

Deleuze, G., & Guattari, F. (1972). "Anti-Oedipus: Capitalism and Schizophrenia." .Published by Penguin

Land, N. (2011). "Fanged Noumena: Collected Writings 1987-2007." Published by .Urbanomic

:Online Documents

Land, N. (1995). "Meltdown." Available at http://www.ccru.net/swarm1/1_meltdown.htm

Srnicek, N., & Williams, A. (2013). "#Accelerate: Manifesto for an Accelerationist Politics." Available at https://www.academia.edu/31673308/_Accelerate_Manifesto_for_an_Accelerationist_Politics

---

**بەشی چوارەم:**

ئـەم دەقـە هیچ سـەرچاوەیەکی لەگەڵـدا نییـە چونکـە بـە تـەواوەتی لـە هۆشـی خۆمـەوە هـەڵقووڵاوە. — لـەم دەقـەدا دەمـەوێت ئارگیومێنتێـک بخەمـە ڕوو کـە بیسـەلمێنێت لـە ڕووی مێتافیزیکییـەوە تشـتێک نـاتوانێت بـە تـەنها لـە خـودی خۆی بکۆڵێتەوە. ئـەم مانەیـەش بۆ مـرۆڤیش درووسـتە. — ئەم ئارگیومێنتەم پەلار و هەنگاو بۆ سەر زۆر بابـەتی دیکـە دەهـاوێت. ئەگـەر ئارگیومێنتەکـەم ڕاسـت بێت، ئـەوا زۆر

تشتی دیکە پووچەڵ دەکاتەوە کە مرۆڤەکان تاوەکوو ئێستاش باوەڕیان پێیەتی.

ئەم ئارگیومێنتەم هەوڵ دەدات ئەم خاڵانەی خوارەوە بپێکێت:

١. گەردوون ئەزەلی نییە.

٢. گەردوون بە تەنهایی ناتوانێت لە خودی خۆی بکۆڵێتەوە.

٣. دەبێت تشتێک لە دەرەوەی تشتێکی دیکە بوونی هەبێت بۆ ئەوەی تشتەکە ساغ بکاتەوە.

...

---

**بەشی پێنجەم:**

تێبینییەکی گرینگ: ئەم دەقە لە ڕووی فەلسەفییەوە دەقێکی گەلێک سەختە و خوێنەر پێویستە ئەزموونێکی زۆری لەگەڵ بازنە فەلسەفی و هونەرییەکاندا هەبێت هەتاوەکوو

تێ بگات لەو مەبەستەی کە دەمەوێت لەم دێڕانەی ئەم بەشەدا بیگەیەنم. -- لە ڕاستیدا ئەم بەشە ڕەخنەگەلێکی زۆری هەڵگرتووە لە بەرامبەر چینی ڕۆشنبیران و ئەو چینەی کە خۆیان بە خوێندەوار و زانا لە قەڵەم دەدەن.

## Archetype

ئارکیتایپ بریتییە لە هێما، بابەت، کارەکتەر، یان مۆتیڤێکی ناسراوی گشتگیر کە لە ئەدەب، ئەفسانە، ئایین و فۆرمەکانی تری دەربڕینی مرۆڤدا لە سەرانسەری کولتوور و قۆناغە کاتییە جیاوازەکاندا دەبیندرێت. زۆرجار ئارکیتایپەکان بە قووڵی لە نائاگایی بەکۆمەڵی مرۆڤەکاندا چەسپاون و وەڵامی بەهێز و زۆرجار غەریزەیی و سۆزداری ورووژێنن. وە هەروەها وەکوو بلۆکی بنیاتنانی چیرۆکگێڕان و تێگەیشتن لە ئەزموونەکانی مرۆڤایەتی کار دەکەن.



## Aesthetics

جوانیناسی لقێکە لە فەلسەفە و بوارێکی لێکۆڵینەوەیە کە بەدواداچوون بۆ سرووشتی جوانی و هونەر و تێگەیشتنی دەکات. زانستی ئێستاتیکا (جوانیناسی) پەیوەندی بە قەدرزانی و لێکدانەوە و هەڵسەنگاندنی ئەزموونە هونەری و هەستیارەکانەوە هەیە. جوانیناسی بریتییە لە لێکۆڵینەوە لەو بنەما و سیفەت و پێوەرانەی کە پێناسەی ئەو شتانە دەکەن کە بە جوان ناسراون و لە ڕووی هونەرییەوە مانادار و بەهادارن.

## Dadaism, Dadaist

دادایزم، یان دادا، بزووتنەوەیەکی هونەری ئاڤانگارد بوو کە لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا سەری هەڵدا، بە پلەی یەکەم لە کاتی جەنگی جیهانی یەکەم و دوای جەنگی جیهانی یەکەمدا جێگەی خۆی کردەوە. — دادایزم ڕێکەوتنە هونەرییە نەریتییەکانی ڕەت کردەوە و بێمانایی و ئاژاوە و ناعەقڵانییەکانی وەک وەڵامێک بۆ ترسناکییەکانی شەڕ و وێرانکەری کۆمەڵگا دەبینی.



## Avantgarde

زاراوەی "ئاڤانگارد" ئاماژەیە بۆ ئەو تاکانە یان بزووتنەوەیەک کە لە پێشەنگی داهێنان و ئەزموونکردندان لە هونەر، کولتوور، یان بوارەکانی دیکەدا. زۆرجار ئاڤانگارد تەحەددای نۆرم و ڕێکەوتن و نەریتە دامەزراوەکان دەکات لە هەوڵێکدا بۆ دەرخستنی زەمینەی نوێ و پاڵنانی سنوورەکانی ئەو تشتانەی کە بە قبووڵکراو یان پێشکەوتوو دادەنرێت.



## بەشی شەشەم:

## نوورۆنۆلۆژیایی [Nûrronlojya]

زانستی نوورۆنۆلۆژی لقێکی زانستی پزیشکییە کە گرنگی بە لێکۆڵینەوە و دەستنیشانکردن و چارەسەرکردنی تێکچوون و نەخۆشییەکانی پەیوەست بە کۆئەندامی دەمار دەدات.




CC0000 : بڕگەیەکی هێکسەدیسیماڵییە. — بریتییە لەم ڕەنگە:

#CC0000

FFD700 : بڕگەیەکی هێکسەدیسیماڵییە. — بریتییە لەم ڕەنگە:

**#FFD700**

## Doomer Music



"مۆسیقای دوومەر" چەمکێکە پەیوەندی بە ژانرێکی مۆسیقاوەیە کە ڕەنگدانەوەی بابەت و هەستەکانی بێ-هیوایی و بێباکی و تووڕەیی بوونگەراییە ... زۆرجار بە

دەنگێکی مـــەزاج، خـــۆڕاگری و خـــەمۆکی تایبەتمەنـــدە، کـــە تێکســـتەکانی لـــە هەســـتی بێ-هیـــوایی و گۆشـــەگیری و دژایەتیکردنی ژیانی مۆدێرن دەکۆڵنەوە. دۆسیەی دوومەر ڕەنگدانەوەی ئەو بێ-هیوایی و بینینەیە کە هەندێک تاک هەست پێ دەکەن. بە تایبەتتر لە جیلی ئێستا و جیلی نوێدا.

---

**Molchat doma – Kletka, 2018, Album: Etazhi**




---

**Beemplîfayîkirdin/بەئامپڵیفاکردن**

بریتییە لە زیادەڕەویکردن لە بابەتێک یاخود گەورەکردنی.




---

## stockholm syndrome

نەخۆشی ستۆکهۆڵم دیاردەیەکی دەروونییە کە بارمتە یان قوربانیانی ڕفاندن هەستی وابەستەبوون، هاوسۆزی، یان تەنانەت دڵسۆزی بەرامبەر بە دەستگیرکەر یان دەستدرێژیکارەکەی پەرە پێ دەدات. ئەم پەیوەندییە سۆزدارییە چاوەڕواننەکراوە دەتوانێت ببێتە هۆی ئەوەی قوربانییەکە بەرگری بکات، بیپارێزێت، یان پشتگیری لەو

کەسـە بکـات کـە زیـانی پێگەیانـدووە یـان خسـتوویەتییە دۆخێکی مەترسیدارەوە بۆ سەر ژیانی.




---

**بەشی حەوتەم:**

**سەرچاوە:**

**Tara Abdullah – Voice Project – 2022 December – Slemani**

---

**بەشی هەشتەم:**

شیکردنەوەیەکی قووڵی زانستی پێناسەکاری لە گۆشەنیگای تایبەت بە خۆم.

---

**بەشی نۆیەم:**

شیکردنەوەی ڕێچکەی گەیشتن بە دنیادیدەیەکی بابەتی، لە نێو قووڵایی ڕێژەگەراییدا.

سەرچاوەی چەمکی <فاکت> :

https://www.etymonline.com/word/fact

فریدریک نیتچە:

Friedrich Nietzsche, The Will to Power translated by Walter Kaufmann and R. J. Hollingdale § 481

---

**بەشی دەیەم:**

هەمان سەرچاوەی بەشی نۆیەم.

---

**بەشی دوازدەیەم:**

ئەم بەشە قووڵترین توێژینەوەیە لە خود. بە بەکارهێنانی خودی نووسەر بۆ سەلماندنی بابەتەکە.

---

لە هەموو کۆتاییەکدا سەرەتایەکیش هەیە.

— عەلی ئەحمەد

## دەربارەی نووسەر:

ساڵی لەدایکبوون : ٢٢ی ١٢ی ٢٠٠٠ — هەولێر.

خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەی ناڵی بنەڕەتی تەواوکردووە. — خوێندنی ناوەندی لە قوتابخانەی تەبایی تەواوکردووە. — خوێندنی ئامادەیی لە قوتابخانەی گەل تەواوکردووە. — خوێندنی زانکۆی لە کۆلێژی ئاداب بەشی فەلسەفە تەواوکردووە.

نووسەر و قوتابییە، وە پێشتر لە ڕووی هونەرییەوە چەندین وێنەی ئەبستراکت و ئاڵۆزی کێشاوە و لە بواری میوزیکیشدا پێشەنگ بووە لە بواری میوزیکی (نۆیز و ئێکسپێریمێنتاڵ و تاقیگەری). — لە ئێستادا هەوڵ دەدات هۆشیاری و زانین بڵاو بکاتەوە بە شێوازێکی تەندرووست.

Youtube : @Ali.Ahmad.H
Tiktok : ali.ahmad.krd
Instagram: @ali.ahmad.krd
Mail : ali.ahmad.krd@gmail

## بەرهەمەکانی دیکەی نووسەر:

مرۆڤ لە لوتکەدا؛ هەوڵێک بۆ باشترکردنی ژیان.

ئەخلاق بە سادەیی.

سەرەتایەک بۆ زانستی ژیربێژی.

چەند سەرنجێک لەسەر ڕووخساریەت.

چەند سەرنجێک لەسەر تەمەن.

هەشت یاسای جەنگەڵ.

وەهمی سەرکەوتن.

چۆن قسە بکەین.

Mental Cornucopia.

The 24-Hour Productivity Hack.

A.I and Ethical Writing.

Hell Within: Understanding Your Inner Demonland

Night Breaker: Fragments From the Post-philosophical Landscape.

